عەبدولسەلام محەمەد حەیدەری

# چەند لایەنێکی ونبوو لە مێژووی کورد

# چەند لایەنێکی ونبوو لەمێژووی کورد

نووسینی

عەبدولسەلام محەمەد حەیدەری-خۆشناو

چاپی یەکەم

٢٠٠٢

ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك

ناوی کتێب: چەند لایەنێکی ونبوو لەمێژووی کورد

نووسینی: عەبدولسەلام محەمەد حەیدەری-خۆشناو

تایپ و مۆنتاژ: هەردی وەهبی

نەخشەسازی بەرگ: بازیان جەلال

چاپ: کاروان ئەحمەد-عەتا مەحمود

چاپی یەکەم: چاپخانەی خاك/ سلێمانی-٢٠٠٢

تیراژ: (٥٠٠) دانە

ژمارەی سپاردنی (٥١٣)ی ساڵی ٢٠٠٢ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

ناونیشان: کوردستان-سلێمانی

ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك

گەڕەکی شۆڕش-خوار پارکی ئازادی

تەلەفۆن: ٢١٢٤١٣٤-٢١٣٠١٠٠

## بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

**پێشکەشە بە**

گیانی پاکی ئەو شەهیدانەی لەپێناوی گەل و نیشتماندا گیانیان بەخشیە کورد و خاکی کوردستان.

# ناوەڕۆك

لاپەڕە

# پێشەکی

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە تا ئێستا ئێمەی گەلی کورد بەتەواوی نەمانتوانیوە مێژووی خۆمان بناسین و بەتەواوی پێی ئاشنابین. دیارە ئەمەش هۆکاری زۆر بوون، ئنجا هۆکارەکانی خۆیی بن یان بەهۆی دوژمنان و داگیرکەرانی نیشتمان و گەلەکەمانەوە بن، ئەگەر هاتبا و ئێمەی گەلی کورد بەتەواوی ئاشنای مێژووی خۆمان باین بەتایبەتی مێژووی کۆنی کورد، ئەوکاتە خۆمان دەناسی و تا ئێستا لەمێژبوو ئێمەش وەکو گەلانی تری سەر زەوی بەئازادی و سەربەخۆیی دەگەیشتین و دەمانتوانی دەستنیشانی داهاتووی خۆمان بکەین.

ئێمەی کورد خاوەنی مێژوویەکی پڕ لەشانازی و دەوڵەمەندین، بەڵام بەداخەوە تا ئێستاش زۆر لایەنی مێژوومان بەشاراوەیی ماوەتەوە یاخود لەلایەن گەلانی داگیرکەری دراوسێوە دزراوە و کراون بەسەروەری و شانازی گەلەکەیان یاخود مێژووی گەلەکەمانیان شێواندووە، بەشێکیش شێواندنی مێژووی کورد لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسانەوە بووە.

داگیرکەران و بەتایبەتی گەلانی دراوسێی کورد ئەگەر مێژووی کوردیان نووسیبێ بەکەموکوڕی نوسراوە و لایەنەکانی شکۆمەندی و جوامێریان نەنووسیوە، بەڵکو لایەنی دوور لەڕاستی و هەڵبەستراویان بەدوورودرێژی نووسیوەتەوە، تەنها بەوەش نەوەستاون و کوردیان بەدڕندە و نەزان و کێوی داناوە،

که ئەمەش دوورە لەهەموو هەستێکی مرۆڤایەتی و نەتەوایەتی و ئاینی. سەرەڕای ئەو بێویژدانیەی بەرامبەر مێژووی گەلەکەمان کراوە کەچی تا ئەمڕۆش سوودمان لەو هەڵە و ئەزموونە زۆرانە وەرنەگرتووە و ڕۆژ بەڕۆژ و سەردەم بەسەردەم ئەم هەڵانە دووبارە دەبنەوە، یەکێك لەهۆکارە سەرەکیەکانی ڕووخان و لەناوچوون و بەئامانج نەگەیشتنی شۆڕش و ڕاپەڕین و میرنشین و دەوڵەتی کورد، بیرنەکردنەوە و ئاگادار نەبوونیان بووە لەمێژووی گەلەکەمان بەهۆی ئەوەی ڕۆشنبیر و خوێندەوارانی ئەو سەردەمە لەجیاتی ئەوەی مێژووی گەلەکەیان لەقاڵبێکی ڕاست و چەسپاو دابڕێژن، لەدەوری ئاگردان و دیوەخانەکان بەکەموکورتی باسکراوە بۆ کات بەڕێکردن و شەوڕاکشان یاخود بۆ ڕازیکردنی دەسەڵاتداران بووە.

بۆیە حەقی خۆیەتی دڵسۆزانە هەوڵبدەین لاپەڕەکانی مێژووی کۆنی گەلەکەمان و گەلانی دراوسێ بپشکنین بۆئەوەی ئەو شتانەی لەمێژوومان ونکراوە یاخود دزراوە بیاندۆزینەوە و مێژووی گەلەکەمان لەدزین و شاراوەیی ڕزگاربکەین.

لێرەدا چەند نمونەیەك باسدەکەم کە ڕاستی ئەمە دەسەلمێنێ:

مامۆستایەکی ئەڵمانی لەدانیشگای (جاکارتا) لەئەندەنوسیا کتێبێکی بەزمانی ئەڵمانی نووسیوە دەربارەی کورد، لەم کتێبەدا باسی دوو گەلی کوردی کردووە، گوایا دوو گەلی کورد هەن، سەیرە ئێمەی کورد سەدان مێژوونوسمان هەیە کە دکتۆرا و بڕوانامەی

بەرزیان لەم بوارەدا وەرگرتووە، هیچیان باسی دوو گەلی کوردیان نەکردووە.

ڕۆژهەلاّتناسێك لەگەشتێکیدا بۆ کوردستان تووشی پیاوێك بووە و پرسیاری شتێکی لێدەکات کابرا دەڵێ: (نازانم)، ڕۆژهەلاّتناسەکە لەیاداشتەکەیدا نووسیویەتی (تووشی پیاوێك بووم کە ناوی نازانم بوو). مێژوونوسانی ئیسلامیش کە زۆر بەدەگمەن باسی کوردیان کردووە و ناوی کوردیان هێناوە، یاخود ئەگەر ڕووداوێك یان ناوێك تایبەت بێ بەکورد ناوێکی دوور لەکوردایەتیان داوەتێ، بۆ نمونە (سەلمانی پاك) کە کوردە و خەڵکی (تیلەکۆیی) ئێرانە و تا ئێستاش خزم و کەسوکاری لەناو هۆزی (زەرزای)ی کوردی ئێران زۆرە کە موسڵمان بوو ناویان نا (سەلمانی فارسی).

هەروەها (جەزیرەی ئیبن عومەر) کە خاکی کوردستانە و ناوی (بۆتان)ە لەهەموو نوسراوانی ئیسلامی بە(جەزیرەی ئیبن عومەر) نوسراوە. دەوڵەتی (خورشیدی خاوەر) و دەوڵەتی (گەنجە)ی کورد تا ئێستاش لەلایەن کەم کەسەوە بیستراوە یان هەر نەبیستراوە.

خوێنەری بەڕێز: هۆی دانان و نووسینی ئەم کتێبەش بەشێکی بۆ ئەمانەی سەرەوە دەگەڕێتەوە و بەشێکیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لەتەمەنی چواردە ساڵیمەوە لەشارۆچکەی بێتواتە، باوکی ڕەحمەتیم (مەلا محەمەدی حەیدەری) کە زۆر شارەزای مێژووی کورد و گەلان بوو، لەم ڕووەوە زۆر سوودی پێگەیاندم و

هیوایەکی لا دروستکردم کە ڕۆژێك لەڕۆژان بتوانم لەم ڕوانگەیەوە خزمەتێکی ئەگەر کەمیش بێت بەگەلەکەم بکەم.

بـۆ ئەمـەش کەوتمـە گـەڕانێکی زۆر بەمەبەسـتی سـەرچاوە پەیداکردن لەکۆنـە کتێبخانـەکانی مامۆسـتایانی ئاینی و گـەڕان بـەزۆر ناوچـەی کوردسـتانی گـەورە و پرسـیارکردن و زانیـاری وەرگرتـن لەخەڵکـە بەتەمەنـەکان و شـارەزایانی مێـژوو و شـوێنەوارەکان. تا توانیم ئەوەی لەبەردەستتدایە کۆیبکەمـەوە و پێشکەشـی خوێنـەران ی گـەلی کـوردی بکـەم و تـا توانیومـە و ویستوومە خـۆ م لەشـتی ئەفسـانە و خـەیاڵی بپـارێزم، لەگـەڵ ئەوەشدا کە هەشت ساڵ خـەریکی دانانی ئەم کتێبـە بووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆکردنـەوە و نووسینەوەی مێژووی کۆنـی کـورد شتێکی هەروا ئاسان نیە، چونکە مێژووی گەلەکەمان مێژوویـەکی ئاڵۆز و کـەم سـەرچاوەیە، بۆیە ئەگـەر کەموکورتیەکیشـی هـەبێت داوای لێبـووردن لەخوێنـەران ئەکـەم و حەزدەکـەم لـەم ڕووەوە ڕاسـتەوخۆ یـان بەبڵاوکردنـەوە لـەگۆڤار و ڕۆژنامـەکان ئاگـادارم بکەنەوە.

عبدالسلام محمد حەیدەری-خۆشناو/ بێتواتە

ئەیلولی ١٩٩٩ز-٢٦٩٩ی کوردی

## ڕوونكردنەوەیەك

بەگوێرەی لێكۆڵینەوەی مێژوونوسان (ئادەم و حەوا) كە لە(بەهەشت)ەوە فڕێدرانە سەر زەوی لەسەر كێوی (ڕاهون) لەهیندستان گیرسانەوە، بەڵام (عەبدوڵڵا كوڕی عەباس) دەڵێت لەسەر لوتكەی كێوی (سەرندیب) لەهیندستان دابەزین، لەبەرئەوە (هیندستان) بەیەكەم مەڵبەندی ئادەمیزاد ئەژمێردرێت و لەوێوە مرۆڤایەتی بڵاوبۆتەوە. لەدوای ئادەم بە (٢٦٥٦) ساڵ نوح پێغەمبەر هاتە ولاتی ڕۆم، زۆر خەریكی هاندانی مەردوم بوو بۆ خواپەرستی، بەڵام كەم كەس بەدەنگیەوە هات و گاڵتەیان پێدەكرد، (نوح) كەشتیەكی گەورەی دروستكرد لەترسی ڕوودانی لافاوێكی گەورە و لەهەر زیندەوەرێكی سەر زەوی نێرومێیەكی خستە ناو كەشتیەكە، ئەوە بوو كردی بەتۆفان و لافاوێكی گەورە هەموو سەرزەمینی داپۆشی، ئەوەی لەناو كەشتیەكە نەبوو لەمرۆڤ و گیانلەبەران هەمووی لەناوچوو، تەنها ئەوانەی ناو كەشتیەكە مانەوە.

ئەو پاشماوە ئێسقانەی كە لەسەر شاخە بەرزەكان دۆزراونەتەوە پێشانی دەدات ئەم لافاوە هەموو زەوی گرتۆتەوە، چونكە ئەو ئێسقانانەی دۆزراونەتەوە هی ئەو گیانلەبەرانەن كە تەنها لەناو ئاودا دەژین. (نوح) هەستیكرد كەشتیەكە وردە وردە نرم دەبێتەوە و لافاوەكە نامێنێ، ڕوویكردە خوا و وتی (خوایە لەجێگایەكی بەفەڕ و پیرۆز دامبەزێنە)، ئەوەبوو كەشتی نوح

لەسەر کێوی (جودی) لەسەر خاکی کوردستان نیشتەوە، تا ئێستاش شێوەی کەشتیەکە لەسەر شاخی (جودی) ماوە و وەکو بەشێك لەشاخەکەی لێهاتووە. بەم هۆیەوە کوردستان بوو بەلانکی دووەمی نەتەوەی (ئادەم) و هەموو مرۆڤایەتی و ئەو گەلانەی سەرزەوی لەکوردستان سەریانهەڵداوە و لەوێوە بڵاوبونەتەوە و هەر کۆمەڵە و شوێنێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و ناوێکی لەخۆی ناوە.

تەورات دەڵێت: کەشتی نوح لەسەر کێوی (ئارارات) دابەزیوە. مێژووی بابلیەکان دەڵێت: کەشتی نوح لەسەر کێوی (نینسیر) نیشتۆتەوە. مێژووی ڕۆمانی دەڵێت: لەسەر کێوی (جودی) نیشتۆتەوە. بەرغوسافی بابلی دەڵێت: کەشتی نوح لەوڵاتی (کوردوئین) نیشتۆتەوە لەسەر کێوی (جودی=گۆتی)، (گوتی) نەتەوەی میدیانە واتە (کوردن). هەندێ لەمێژوونوسانی ڕۆژئاوا دەڵێن: کورد لەدەوروبەری کێوی (جودی=گوتی) بڵاوبونەتەوە بەشوێنانی تردا.

نوح سێ کوڕی لەگەڵدا بوو لەکەشتیەکەدا (سام، یافث، حام)، (عەرەب و جولەکە و فارس) لەنەوەی (سام کوڕی نوح)ن، (تورك و سەقالیبە و یەئجوج و مەئجوج) لەنەوەی (یافث کوڕی نوح)ن، (بەربەر و سودان و قیبطی) لەنەوەی (حام کوڕی نوح)ن. زۆر دێهات و جێگە لەکوردستان بەناوی (نوح)ەوە دەوترێت وەکو (شارنوخ=شارناخ) کە لەڕەگەزدا (شاری نوح)ە. وشەی (زاخۆ)

لەوشەی (ژێر نوخ) دروستبووە، واتە (ئەو هەرێمەی دەکەوێتە خوارووی ناوچەی نوح).

لەناو کەشتی نوحدا (٤٠) پیاو و (٤٠) ژنی تێدا بوو، لەبناری چیاکە گوندێکیان دروستکرد بەناوی (هەشتایانە) واتە (سوق الثمانین). تەورات لەسفری تەکوین دەڵێت: نوح حەوسەد ساڵ لەهیندستان ژیاوە، سەدوپەنجا ساڵ لەکوردستان ژیاوە. هەندێ مێژوونوس دەڵێن: لەو ماوەیەی کە نوح لەکوردستان بووە سێ کەس بەناوی (زەردەشت) ئامۆژگاری خەڵکیان کردووە بۆ خواپەرستی.

لەو نوسراوانەی لەکۆنەوە لەسەر قوڕ و بەردەکان نوسراون بەپێی لێکۆڵینەوەی زانایان و مێژوونوسان ئەوە دەسەلمێنن کە کەشتی نوح لەکوردستان، واتە لەوڵاتی میدیا لەسەر کێوی (جودی=گوتی) نیشتۆتەوە و هەر لەوێ و لەدەوروبەری، دێهات و شارۆچکەیان دروستکردووە ئەنجا بەرەبەرە لەدنیادا بڵاوبونەتەوە. محەمەد قاسم محەمەد لەکتێبەکەیدا دەڵێت: نێوانی ئادەم و نوح (٢٦٥٦)ساڵە و نێوانی تۆفان و ئیبراهیم (٢٣٩٠) ساڵە، واتە نێوانی ئادەم و ئیبراهیم (٤٣٤٦) ساڵە، چونکە (٧٠٠) ساڵی تەمەنی (نوح) لەهیندستان واتە پێش تۆفان کەمدەکرێتەوە.

## وشەی ئاری

وشەی (ئاری) بەواتای (ئاگر) پیتی (ی) ئامڕازی پاڵدانە، واتە (ئاگر+ی=ئاگری)، هەروەها وشەی (ئاتەر، ئاور، ئاهر، ئاهیر) بەمانای (ئاگر) هاتووە لەزمانی (ماد)دا. بەزمانی فارسی بەئاگر وتراوە (ئازەر، ئاتەر، ئاگر، هیر)، لەبەرئەوەی کورد لەکۆندا ئاگری لا پیرۆز بووە پێیان وتراوە (ئاگری) وشەی (ئاگری) وردە وردە لەدەربڕیندا سوکتر کراوە، تاکو بۆتە (ئاری) بۆ کۆی (ئاری) وتراوە (ئاریا).

## هۆز و نەوەکانی ئاری

نەتەوەی ئاری (٣٤٠٠) ساڵ بەر لەزایین لەشوێنی خۆیان بڵاوبونەتەوە، هەندێکیان بەرەو (هیندستان) ڕۆیشتوون، (هیندییەکان) نەوەی ئەوانەن، هەندێکیشیان ڕوویانکردۆتە (ڕۆما و یۆنان و ماکدۆنیا) و لەوێ نیشتەجێبوون، ڕەگەزی (تورك و لاتین و ئەرنائوت) لەوانەن. کۆمەڵێکیش ڕووەو وڵاتی ئێران ڕۆیشتون، ئەوانەش بوونەتە دوو بەش بەشێکیان ڕوویان لە (خوراسان و مازەندەران و کەناری دەریای خەزەر و لوڕستان و ئازەربایجان و ئەرمەنستان و کوردستان و شامات و کەناری دەریای سپی) کردووە. هۆزەکانی (خەزەر و کورد و لوڕ و دەیلەم و چەرکەس و ئەرمەن و ئەبازە و ئەلبان) لەم کۆمەڵەیەن، بەشێکیان هەر لەجێگای خۆیان ماونەتەوە کە پێیان دەوترێ

(سەقالیبی و سەکر و وسکا) ئەم کۆمەڵەیە بەدرنگەوە بەرەو وڵاتی ئێران کشاون، بەلام شەڕێکی سەخت لەنێوانیاندا ڕوویدا و ئێرانیەکان بەسەریاندا زاڵبوون و دەریانکردن.

هەندێ مێژوونوس دەڵێن: کورد و ئەرمەن لەکەناری دەریای باڵتیکەوە هاتونەتە دەوروبەری قەفقاس و کێوەکانی ئارارات لەوێوە هاتونەتە خوارەوە و لەڕۆژهەلات تاکو کەنداوی عەرەب و لەڕۆژئاوا تا کەناری دەریای سپی هاتوون. هیرۆدۆت لای وایە (ئەفغانیەکان و بلوج و کەرمان و پارس) کە لەکۆمەڵێك پێکهاتوون و ڕوویانکردۆتە ئەفغان، بەم کۆمەڵەیە دەوترێ (سفن) تاکو کەناری دەریای عومان بڵاوبونەتەوە. هەروەها نەتەوەکانی (ماد، پارس، تاجانی، ئەزنادیان، ئابادیان، چەغزی، بلاج، سەڵت، های، ئۆسلاو، جەرمەن، لاتین، ئەنەردان) لەنەوەی ئارین و نەتەوەکانی بەم شێوەیە بەسەریاندا دابەشبوون:

١–ئەنەردان: بریتین لە (هیز و سیك و کشمیر و بەنجاب).

٢–لاتین: بریتین لە (فەرەنسی و ڕۆمانی و پرتوغالی و ئیسپانی و ئیتاڵی).

٣–جەرمەن: بریتین لە (ئەڵمانی و ئینگلیزی و ئەسکەندیناوی و سایکسی و کورك).

٤–ئوسلاو: بریتین لە (ڕوسی و چیك و لەهستان و سرب و پۆڵندە).

٥–سەڵت: بۆمبەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا پێکدێنن.

٦-های: بریتین له (ئەرمەنیەکانی ئارارات)، وشەی (ئەرمەن) مانای (دلێر).

٧-بلاج: بریتین له (بەلجیکی و بولغاری).

٨-چەغزی: بریتین له (ڕوس و سەمەرقەندی) و (سەگلاو و سوغدی)یشیان پێدەوترێ، (سەقالیبه) بەمانای (مووزەرد) دێ، وشەی (سەمەرقەند) مانای (قەلاتی گلین) وەکو (داشکەند) بەمانای (قەلاتی بەردین). هەندێ مێژوونوسی عەرەب دەلێن: وشەی (سەمەرقەند) لەڕاستیدا (شەمەرکەندە)، لەوکاتەی سوپای ئیسلام گەیشتە ئەوێ، (شەمەر) که سەرکردەی سوپای ئیسلام بوو فەرمانیدا بۆ هەلکەندنی جێگەی خێوەت و حەوانەوە، خەلکی ئەوێ بەو جێگەیەیان وت (شەمەرکەند) واته شەمەر هەلیکەندووە و بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار بۆته (سەمەرقەند).

٩-ئابادیان یان ئابادینان: ئەوانە بوون که لەدەوروبەری (سابلاغ=مهاباد) ژیاون. وشەی (مهاباد) ناوی یەکەم پێغەمبەره که بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست نێردراوە، کتێبی (دەساتیری) خوای گەورە بۆی ناردووە، (ئاریای گەورە) بەدەستووری ئەم کتێبه ڕەفتاریان کردووە، ئێستاش له (قەفقازیا) کۆمەلێك بەناوی (چەرکس) لەسەر ئەم ئاینه ماون، دوا پاشای ئەم کۆمەلەیە ناوی (ئاباد) بووە، هەروەها (ئابتین) باوکی فەرەیدون لەوشەی (ئابادیان) وەرگیراوە.

هەندێ دەلێن: نەمرود کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نوح، پاشای ئەم کۆمەلە بووە. تەورات بەندی نۆیەم، ڕستەی هەشتەم

دەڵێت: نەمرود کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نوح، لەهەرێمی ژەنگار (لەکوردستانی باشوور) ژیاوە، نەتەوەی ئەو تاکو ئەفەریقا بلاّوبونەتەوە، نەمرودیەکان بەدکردار و پیاوکوژ و وێرانکەر بوون، کردەوەیان دڕندانە بووە، لەجیاتی کلاّوی سەر کەللەی گایان لەسەرناوە و پێستی پڵنگیان کردۆتەبەر، بۆیە پێیان وتراوە (دێو) وە بەپاشاکە وتراوە (خدێو) واتە (خوای دێو)، تاکو ئەم ساڵانەی ڕابردوو بەپاشا و سەرکردەکانی میسر دەوترا (خدێو)، هەروەها ئەم کۆمەڵەیە (جبار)یشیان پیٚوتون لەبەرئەوەی (بەهێز و بێبەزەیی) بوون.

١٠-ئاجامی: بریتین لەنەوەکانی (یاسان جامی) کە ئەچنەوە سەر ڕەگەزی (شای مەجول) لەشاکانی یاسانیەکان. لەزمانی عەرەبیدا وشەی (ئاجام) کراوە بە(عجم) کە لەوکاتەدا بۆ دوو هۆز وتراوە (هۆزی گوڵشایی و هۆزی کانشییان). وشەی (شا) لەزمانی ماد و پارسی کۆندا بەم مانایانە هاتووە (دروستکەری بونەوەر، سەروەر، خاوەن هێز). ڕەچەڵەکی (پێشدادیەکان) کە لە(کەیومەرث) دەستپێدەکات لەنەوەی (شایاسانی) ئەجەمن.

هەندێ لەمێژوونوسان زنجیرەی پادشایانی ئێران بەم جۆرە دادەنێن:

١-پاشایانی ئابادی: لە (ئابادشا)وە دەستپێدەکات.

٢-جیشەکان: لە (شاجن ئەفرام)وە دەستپێدەکات.

٣-گوڵشایەکان: لە (ئیلۆشا)وە دەستپێدەکات.

٤-یاسانیەکان: لە (یاسانشا)وە دەستپێدەکات.

٥-پێشدادیەکان: لە (کەیومەرث)ەوە دەستپێدەکات.
٦-کەیانیەکان: لە (کەیقوبادی کوردی)ەوە دەستپێدەکات.
٧-ساسانیەکان: لە (ئەردەشێر)ەوە دەستپێدەکات.
٨-ئەشکانیەکان: لە (ئەسکەندەری ڕۆمی)ەوە دەستپێدەکات.

هەروەها زنجیرەی خێزانەکانی شایانی ئێران بەم جۆرەیە: (خێزانی ئازادی، خێزانی پێشدادی، ماردۆشی تایانی، کەیانی، هەخامەنشسی، سلوکی، پارسی، ئەشکانی، ساسانی). پێشدادیەکان کە لەنەوەی (کەیومەرث)ن لەهۆزی (یاسان ئەجەمن) کاتێ (شایاسان) مرد، کەسێکی وا لێهاتوو نەبوو جڵەوی فەرمانڕەوایی ئێران بگرێتەدەست، لەبەرئەوە دەوری (ملوك الطوائف) دروستبوو واتە (شایانی هۆزەکان). (کەیومەرث کوڕی یافث کوڕی نوح) کە بە(کومری)ش ناسراوە، (٢١٤١) ساڵ بەر لەزایین بەهۆی زیرەکی خۆی بۆتە (شا) و شاری (بەڵخ) دروستدەکات، ئینجا شاری (ئیستەخر و دەماوەندی) دروستکرد و ناوەڕۆکی کتێبی (دەساتیری) کردە یاسای دەوڵەتەکەی.

١١-مادایان: لەڕەگەزی (ئاری)ن و لەنەوەی (مادای کوڕی یاخت کوڕی نوح)ن، (کورد و گێلان و خەزەر و دەیسەم) لەنەوەی (مادایانن)، وشەی ماد (٩٠٠) ساڵ بەر لەمێژووی زایینی بڵاوبۆتەوە، زۆر لەمێژوونوسان دەڵێن: وشەی (کورد) زۆر کۆنترە لەوشەی (ماد). لەم بارەیەوە هیرۆدۆت دەڵێت: ماد لەڕەگەزی (ئاری)ن کە لەپێشدا (کورد)یان پێوتراوە. کتێبی (نخبة الأزهرية)

دەڵێت: ماد بریتین لە (فارسە کۆنەکان و کوردەکان)، کە عەرەب بە (ئاجام=ئەجەم=عەجەم) ناویاندەبەن.

هەندێ مێژوونوس دەڵێن: (فارس و کورد و دەیلەم نەبەت و جەرامیقە و خەزەر) لەنەوەی (ئاشووری کوڕی سام کوڕی نوح)ن، بەلاّم بە(سامی) کردنی ئەمانە دوورە لەڕاستی. فارسەکان ئەو (ئاری)یانەن کە لە (سفن و ئەهواز و کەناری دەریای عومان) نیشتەجێبوون، وشەی (پارس) لە (پارس کوڕی عامر کوڕی یاخت کوڕی نوح) وەرگیراوە.

## هۆزەکانی ماد

گەلی ماد دوهەزار ساڵ (پ. ز) لەم هۆزانەی خوارەوە پێکهاتبوو:

١-هۆزی (پارتاستی) کە لەهەرێمی (شاری ڕەی و وارمین و کەناری دەریای خەزەر) نیشتەجێبوون.

٢-هۆزی (بوزیایوس) کە لەپێشدا لەکەناری دەریای مازەندەران بوون، دوایی بۆ عێراق و هەمەدان کۆچیانکردووە.

٣-هۆزی (ئاستروتسات) لەدەوروبەری شاری سەمەرقەند و هەرێمی خوارەزم بەکشتوکاڵ خەریك بوون.

٤-هۆزی (ئاریزانت) لەئازەربایجان و ڕۆژئاوای ئێران و هەندێکیشیان لەکەناری ڕووباری (ئاراکس=ئاراس) نیشتەجێبوون.

٥-هۆزی (بودی) کە ڕوویانکردۆتە هیندستان.

٦-هۆزی (ماث=ماگ=ماغ=مەگۆش) کە عەرەب پێیان دەڵێن (مەجوس).

٧-هۆزی (دیماستان) لەدەوروبەری مازەندەران و گەیلان بلاوبونەتەوە.

## سەرهەڵدانی کورد یان سەرهەڵدانەوەی کورد

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە بەپێی پاشماوە و نووسینە کۆنەکان کورد لەنەوەی (ئاری)یە و لەکۆمەڵی (هیندۆئەوروپی)یە، کە بەهەزاران ساڵ بەر لەئەمڕۆ لەکوردستان بلاوبونەتەوە بەم شێوەیە:

١-لەڕۆژهەلاتەوە بەکەناری ڕووباری دیجلە بەزنجیرە چیاکانی زاگرۆسەوە تا کەنداوی عەرەب و ڕۆخی دەریای عومان چوون.

٢-لەڕۆژئاوا بەدرێژایی ڕووباری فورات و بەزنجیرە چیاکانی تۆرس تاکو شامات و کەناری دەریای سپی چوون. ئەم کۆچکردنەش کۆمەڵ کۆمەڵ بووە، بەلام هەندێ مێژوونوس دەڵێن کورد بەیەك کۆمەڵ هاتونەتە قەفقاز و ولاتی ئەرمەن، لەدەوروبەری دەریای باڵتیکەوە هاتوون و لەوێوە بەشاخەکانی ئارارات و جودی بەرەوخوار هاتوون، لەڕۆژهەلات تا دەریای عومان و لەڕۆژئاوا تا کەناری دەریای سپی چوون. هەندێ مێژوونوسیش دەڵێن: کورد لەڕۆژهەلاتەوە بەدرێژایی کێوەکانی زاگرۆس بۆ

خوارووی دەریای مازەندەران هاتوون و لەوێوە تاکو کەناری دەریای سپی بڵاوبونەتەوە، بەڵام کۆمەڵێك کورد لەدەوروبەری دەریاچەی (وان) نیشتەجێبوون و فەرمانڕەوایی هەرێمەکەیان گرتۆتەدەست.

مینۆرسکی لای وایە گەلی (ماد) لەڕۆژهەڵاتەوە هاتوون، بەڵام لەڕێگادا تووشی گەلی (کاردوا) بوون و هەموویان لەکوردستانی ئێستادا ماونەتەوە لەبەر ئەم هۆیانە:

١-لەباکوورەوە دەریای (مازەندەران) و کێوەکانی (ئارارات) بوونەتە بەربەستیان.

٢-لەباشوورەوە دەوڵەتی (عیلام) و دەریای عومان بۆتە بەربەستیان.

٣-لەخۆرئاوا دەوڵەتی (ئەکەد و سۆمەر) بوونەتە بەربەستیان.

بەگوێرەی پاشماوە کۆنەکان کورد لە (ئەکەد و سۆمەر و کلدان و ئاشوور) کۆنترە، هەروەها هەندێ لەهۆزەکانی کورد وەکو (لۆلۆ و کاسی و گۆتی) لەدەوروبەری زنجیرە چیاکانی زاگرۆس نیشتەجێبوون و هاوسێی (سۆمەر و ئەکەد و عیلام) بوون و لەگەڵیان هاوپەیمان بوون و لەوکاتەدا ناوی (کلدەوئاشوور) سەریانهەڵداوە.

ئەو کوردانەی لەلای سەروو هاتوون پێیان وتراوە (گودی یان گوتی) عەرەب بە(جودی) ناویبردوون، چونکە لەلای چیای (جود و ئارارات)ەوە هاتوون، ئەوانەی لەڕۆژئاواوە هاتوون پێیان وتراوە (کوردی یان کورتی)، بەڵام لەبەرئەوەی کە زۆر ئازا و زیرەك بوون

فارسەکان پێیان ئەوتن (سیرتی) وشەی سیرتی لەفارسی کۆن بەزمانی کوردی هەورامان بەمانای (دلێر و نەبەرد) هاتووە. هیرۆدۆت دەڵێت: (٩٠٠) ساڵ بەر لەمێژووی زایینی (کورد) ناوی (ماد) بووە، هەر لەوکاتەدا (سەلمانازاری) ئاشووری شەڕی لەگەڵ کردوون. هەندێ مێژوونوس بەبەشی کوردی ڕۆژئاوا دەڵێن (ئاراراتی)، وە بەبەشی ڕۆژهەلات دەڵێن (مادایان)، بەلام تا ئێستا نەزانراوە کامیان لەپێشدا هاتونەتە کوردستان، هەندێ مێژوونوس دەڵێن (مادایان) هەزار ساڵ (پ. ز) هاتوون بۆ کوردستان.

## سنووری وڵاتی کورد

دەربارەی سنووری وڵاتی کورد بۆچوونی جیاجیا هەیە، هەندێك مێژوونوس پێیانوایە سنووری کوردستان لەڕۆژهەڵاتەوە ئازەربایجان و زنجیرە چیاکانی زاگرۆسە، لەباکوری ئەرمەنستانە، لەباشووری عێراقی عەرەب و بابلستانە، لەڕۆژئاوای ڕووباری فوراتە. هەندێکیش سنووری کوردستان بەجۆرێکی تر دیاریدەکەن و دەڵێن: لەباکووری کێوەکانی ئاغریداغ و ئاراراتە، لەباشووری عێراقە (واتە کەمێك سەرووی شاری بەغداد)، لەڕۆژهەڵاتی وڵاتی فارسە، لەڕۆژئاوای ڕووباری فوراتە. بەگوێرەی ئەمە ئەرزەڕۆم و هەموو ئاسیای بچوك خاکی کوردستانە و کوردی لێژیاوە.

زۆر لەمێژوونوسان پێیانوایە شاری (بەهار) کە لەسەرووی هەمەدانی ئێستا بووە، کوردی لێبووە و شارێکی کوردنشین بووە، بەلاّم ئەم کوردانە هاتوونەتە هەرێمی (چەمچەماڵ). هەروەها دەڵێن: ولاّتی ئەرمەن و جەزیرە بەشێك بووە لەکوردستان و لەوکاتەدا کوردستان کرابوو بە (١٩) هەرێم بەم شێوەیە: (ئالان، ئالیشە، بەهار، خاتوون، خەفتیان، دەربەندی تاج، دەربەندی زەنگی، دارنیل، دینەوەر، چەمچەماڵ، سوڵتان ئاباد، شارەزوور، کرماشان، کەرەند، خۆشاب، کەنگاوەر، ماهیدەشت، تاقوەستام، بێستوون).

هەندێ مێژوونوس دەڵێن: بەگوێرەی ئەو پاشماوە و نوسینانەی دۆزراونەتەوە دەرکەوتووە (٢٠٠٠) ساڵ (پ. ن) کوردستان ناوی ولاّتی (کارداکا) بووە، کە دراوسێی هەرێمی (سۆی) بووە کە دەکەوێتە هەرێمی دەریاچەی (وان)، ئارامیەکان بەو هەرێمەیان وتوە (حەوزی کاردۆ) قەلاّیەکی کۆن لەو هەرێمەدا هەیە بەناوی (قەلاّتی سۆی). جگە لەئارامیەکان، هەموو مێژوونوسان بەم هەرێمەیان وتوە (کوردەوان) واتە ولاّتی کوردان، وە بەجەزیرەی (إبن عمر) وتراوە (کازارنای کاردۆ)، ئەرمەنیەکان بە (کوردۆخ) ناویانبردووە، عەرەب پێیان وتوە (کاردای). هەندێ مێژوونوس دەڵێن: جەزیرەی (إبن عمر) بەشێك بووە لەولاّتی (کاردای) و ئەم شارانەی هەبووە (ئیستاتین، جودی، فەیرۆز، شاپۆر) وە گەلێ گوند و دێهات و هەرێمی فراوانی هەبووە.

## زمانی کوردی

بەهەموو بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا دەرکەوتووە کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە و سامانی نەتەوەی کوردە، نەك وەکو هەندێ قەڵەمگۆڕانی مێژوو دەڵێن: زمانی کوردی لقێکە لەزمانی فارسی کە هیچ بەڵگەیان نیە، تەنها دژایەتی نەتەوەی کورد نەبێ.
زۆر لەمێژوونوسان دەڵێن: زمانی کوردی لەهۆزەکانی کوردی زاگرۆس ماوەتەوە وەکو زمانی: (لۆلۆ، کاسی، سوباری، گۆتی)، ئەم هۆزانە کەمێك زمانیان جیاوازی هەیە، بەلاّم لەڕەگەزدا یەك زمان بوون ئەویش زمانی کوردی بوو، هەندێ زمانەوان دەڵێن: زمانی گەلی ماد و ئاڤێستای زەردەشت یەك زمان بووە، بەلاّم بۆ سەلماندنی ئەمە بەڵگەی گەش نیە.

ئاسترابونی یۆنانی دەڵێت: ماد و فارس لەزمانی یەکتری دەگەیشتن زمانیان لەیەکتری نزیك بووە، هەندێ مێژوونوس لایانوایە زمانی (موکری) زمانی کۆنی ماد بووە، کتێبی ئاڤێستا و کتێبی زەند کە بەزمانی مادی کۆن نوسراون هەروەکو زمانی موکری ئێستایە. هۆرات و زۆر زمانەوان دەڵێن: (زمانی ماد و ئاڤێستا یەك شێوەیە). زمانی کوردی لەچوار شێوە زمانی سەرەکی پێکهاتووە، کە بریتین لە:

١-شێوەزمانی لوڕ. ٢-کەلهوڕ. ٣-کرمانج. ٤-گۆران.

هەر لەوانەوە زۆر شێوەزمانی تر لەناو کۆمەلاّنی کورد سەریهەڵداوە و لەیەکتری نزیك بوون، یەکەمجار لەئارارات و دووەمجار لەزاگرۆس و ئەنجا لەئەسپەهان و دوایی

لەئەکباتان=هەمەدان، هەروەها لەبێستون و مەدائن زمانی کوردی جێگیربووە و بڵاوبۆتەوە، کە (ئەسکەندەری ماکدۆنی) کوردستانی گرت، زمانی کوردی بەڕەسمی ناسرا و لەسەرچاوەی ڕووباری دیجلە تا کەنداوی عەرەب قسەی پێکراوە و پێی دەنوسرا.

ڕیشەی زمانی (ئاریانی) کۆن بەگشتی لەزمانی ماد وەرگیراوە کە بەزمانی (ئانزان) ناوی دەرکردووە، وشەی (ئانزان) بەزمانی (ماد) واتە (ئینسان)، زمانی (پارس و عیلام و هیندی) لەو وەرگیراون. سێهەزار ساڵ بەر لەمێژووی زایینی، ماد بەم زمانە قسەیکردووە بەرەبەرە هەندێ شێوەی جیاجیای لێپەیدابوو. وشەی (پەهلە) لەزاراوەی فارسی کۆندا بەمانای (شار) هاتووە، هەروەها بەمانای پایتەختی دەوڵەت هاتووە وەکو (ئەسپەهان، مەدائن، ئەکباتان)، وشەی (پەهلەوان) بەمانای (پارێزەری شار) هاتووە لەزمانی کوردیدا (پاڵەوان) بەواتای (ئازا) هاتووە، هەروەها وشەی (پاڵە) کە بە(دروێنەکەر) دەوترێ لە (پەهلە)وە هاتووە واتە (ئازا). وە بەهۆی هاتوچۆ و لەیەکگەیشتنی گەلی (ماد و کلدان و ئاشوور و فارس) زۆر وشەیان لەیەکتری وەرگرتووە.

ئاخاوتن و شێوەزمانی کوردی بەم جۆرەیە:

١-کرمانجی باکوور: بایەزیدی و بۆتانی و هەکاری و شەمدینانی و بادینانی.

٢-کرمانجی ناوەڕاست: سلێمانی و موکری و سۆرانی و ئەردەلانی و گەرمیانی.

٣-کرمانجی باشوور: لوڕی و بەختیاری و مامەسێنی و لەك و کەلهور.

٤-گۆران: گۆرانی ڕەسەن و هەورامانی و باجەلانی و زازا.

## نووسینی کوردی-ماد

مامۆستا مەلافەتحوڵڵا هەرتەلی لەکتێبی (مبحث عن منطقة بیتواتە) دەڵێت: (لەڕۆژگارەکانی دەوڵەتی ماد جۆرە نوسینێکیان بەکارهێناوە کە پیتەکانی وەکو ئەندام و ئادگاری مرۆڤ ڕێکخراوە، بەڵام دەربارەی ئەم نوسینە بەڵگەیەك نیە کە چۆن کارییێکراوە، لەساڵی (١٩٣٢)ی زایینی لەگوندی (هەودیان) لەهەرێمی ڕەواندوز بەردێك دۆزراوەتەوە کە ئەم هەڵکەندنانەی لەسەربوو: (سەری کچێك، دەستی کوڕێك، لاقی مرۆڤێك و دوو گوێ) وا گوماندەکرا کە نووسینی سەردەمی ماد بێ، ئەم بەردە کەوتە دەستی (فەرهاد) ناوێك خەڵکی دەوروبەری ئارارات بوو.

مامۆستا عەبدولقادر باڵەکی لەکتێبی (تهذیب التأریخ) دەڵێت: (کورد بەخەتی بزماری شتی نووسیوە تاکو پەیدابوونی نووسینی (ماسی سۆرانی) کە جۆرە خەتێکی دروستکرد، گوایە ئاڤێستای زەردەشت بەمجۆرە خەتە نوسراوەتەوە، هەروەها پاشایانی (هەخامەنشی) نووسینی بزماریان بەکارهێناوە، لەساڵی (١٩١٨)ی زایینی (سەید حسێن) ناوێك لەناو کوپەیەکدا کتێبێکی دۆزیەوە، ئەم کتێبە بەسێ جۆرە نوسین نوسرابوو: (خەتی ئارامی، خەتی یۆنانی، خەتی ماسی سۆران)، لەو کتێبەدا زۆر باسی (فەرهادی چوارەم) دەکات کە پاشای (ئەشکانی) بووە لەسەدەی (١٢)ی (پ. ن)، کە ئەوکاتە هەورامانی کوردستان لەژێر دەسەلاتی ئەرمەنیەکاندا بووە، بەلام بەسەرهەڵدانی ئایینی

ئیسلام ئەم خەتانە کزبوون و لەناوچوون و خەتی (کوفی) هاتەکایەوە.

مامۆستا مەحمودی حەمامیان لەکتێبی (ستارەی تابان) دەڵێت: دووهەزار ساڵ بەر لەمێژووی زایینی پیاوێکی (ماد=کورد) لەدەوروبەری دەریای خەزەر پەیدابوو بەناوی (ئاپۆنەورۆن) جۆرە نوسینێکی داهێنا کە دەوڵەت بەو نووسینە شتی تۆمارکردووە. لەگوندی (کۆزەکەرێس) لەهەرێمی (شارویران) نزیك مهابادی ئێستا گۆزەیەك دۆزرایەوە کە پاشماوەی ئەم نوسینەی لەسەربوو وەکو بیستراوە (میستەر ڕیچ) ئەم گۆزەیەی بردووە.

## ڕابردووی کورد

(٣٦٠٠) ساڵ (پ. ز) گۆتیەکان بوونەتە فەرمانڕەوا لەکوردستان، (نارامسین کوڕی سارگۆنی ئەکەدی) بەدەستی گۆتیەکان کوژرا، لەو شەڕەی (لۆلۆکان) نایانەوە کە هاوڕەگەزی (گۆتیەکان) بوون، ولاتی (ئەکەد و بابل) کەوتە دەستی دەوڵەتی (گۆتی)، بەلام گۆتیەکان پەیوەندیان لەگەڵ (عیلامیەکان و سۆمەریەکان و ئاشووریەکان و کلدانیەکان) پتەوکرد، زۆری نەخایاند لەکاتی فەرمانڕەوایی (شاگۆتا)، عیلامیەکانیش کەوتنە ژێر دەستی دەوڵەتی (گۆتی) و باج و سەرانەیان دەدا بە (شاگۆتا) شای (گۆتیەکان).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە کورد بەر لە (شاسارگۆنی ئەکەدی) هەبوون و دەوڵەتیشیان هەبووە، (لۆلۆکان) کە کوردن بەر لە (نارامسین) فەرمانڕەوای وڵاتی (زاموا) بوون. هەندێك مێژوونوس دەڵێن: (لاسیراب) یەکەم شای (لۆلۆکان) بووە، دوای ئەوەی دەوڵەتی (بابل) کەوتە جەنگ لەگەڵ دەوڵەتی (لۆلۆ)، لەئەنجامدا سوپای (لۆلۆ) شکا و پاڵیدایە کێوەکانی (زاگرۆس) و وڵاتی (ماد) سێ سەدە کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی (بابل) و باج و سەرانەیان دەدایە دەوڵەتی (بابل). لەساڵی (٢١١٨)ی پ. ز (شانینە) شای دەوڵەتی ئاشوور سوپایەکی زۆری هێنایە سەر کوردستان و داگیریکرد و فەرمانڕەواکەی لەسێدارەدا و هەموو وڵاتی کوردستانی گرت و تاکو دەوروبەری شاری (بەڵخ)، بەڵام قەڵای شارەکەی بۆ نەگیرا و لەدواییدا (شاسەمیرامیس) قەڵاکەی گرت.

لەساڵی (٢٠٢١)ی پ. ز لەکەناری دەریای ڕەش کۆمەڵێك کورد سەریانهەڵدا، ئەم کۆمەڵەیە دەوڵەتێکی دروستکرد پایتەختەکەی لەنزیك ڕووباری خابوور بوو، بەڵام تا ئێستا ناوی ئەم دەوڵەتە نەزانراوە. بەسەرۆکایەتی (شاخانزیر)ی کوردی هۆزی (لۆلۆ و کاسی و گۆتی) لەکوردستان دەوڵەتێکی مەزنیان دروستکرد نزیکەی شەش سەدە فەرمانڕەوایی کرد، لەوکاتەدا کۆمەڵێك لەکوردەکان باجیان دەدا بەدەوڵەتی ئاشووری، بەڵام سەرکردە (توسە) لاریبوو لەباجدان و لەدواییدا لەنزیکی شاری (بەڵخ) و دەوروبەری ئەمارەتێکی کوردی دروستکرد، یۆنانیەکان بەم

سەرکردەیە دەڵێن (دیۆکس) کە ناوی (توسە کوڕی فەریبەرزی مادی) بووە زۆر زیرەك و لێهاتوو بووە.

لەسەدەی (١٦)ی پ. ز میتانیەکان کە کورد بوون لەکوردستان دەوڵەتێکیان دروستکردووە، لەباشوور تاکو خوارووی کەرکوکی لەژێر دەستدا بووە، واتە هەرێمی (ئارابخا و دەشتی هەولێر و کوردستانی باکووری ئێستای) لەژێر فەرمانڕەوایی ئەواندا بوون. (ئاداد نیزاری) ئاشوور دەڵێت: (بەهۆی ئەوەی کە میتانیەکان خەریکی جەنگ بوون من بەهەلم زانی کە سنووری دەوڵەتەکەم فراوان بکەم و هەر بەم هۆیەوە (میتانی و کاسی و سۆباری و گۆتی و لۆلۆ) کە هەموویان لەڕەگەزدا (کاردو) بوون، هێنانمە ژێردەستی خۆم و باجم لێیان وەردەگرت). ئەمە لەسەر بەردێك نوسراوە کە لەنزیك نەینەوا دۆزراوەتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی (١٣١٠)ی پ. ز.

لەساڵی (١٣٨٠) پ. ز (سەلمانزاری) شای ئاشوور جەنگێکی سەختی لەگەڵ دەوڵەتی (گۆتی) نایەوە و لەئەنجامدا ڕووخاندی، کوردەکان کەوتنە ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی (ئاشوور) و هەندێکیان پاڵیاندایە کێوەکانی (زاگرۆس). لەساڵی (١١٠٠)ی پ. ز (تەگلان شای ناوداری ئاشوور) گەلێك شەڕی لەگەڵ کوردەکان کردووە، بەتایبەتی لەگەڵ کوردەکانی (ئارۆ) واتە (کێوی ساسۆن). لەساڵی (٩٠٠)ی پ. ز (ئازیزپاڵ) شای ئاشووری گەلێك ئازاری کوردەکانی داوە زوڵمی لێکردوون، لەبەرئەوە کوردەکان لێی هەڵگەڕانەوە و خۆیان ڕزگارکرد، بابلیەکان لەم

ڕاپەڕینەدا پارمەتی کوردەکانیان داوە و بەهەردووکیان وڵاتی ئاشووریان داگیرکردووە، ئەم (شا)یە چوار جار سوپای ناردۆتە سەر کوردەکان، بەڵام هەمووی بەشکاوی گەڕاوەتەوە، هەندێ مێژوونوس دەڵێن: لەجاری چوارەم هەندێ شاری کوردی گرتووە.

مامۆستا مەلا عەبدولقادر باڵەکی لەکتێبی (تهذيب التأريخ)دا دەڵێت: کە ئاشووریەکان هاتن بۆ سەر کوردەکان، کوردەکان بەسەرۆکایەتی (تامیخا) ڕوویانکردە چیاکانی زاگرۆس. لەسەدەی نۆیەمی پ. ز (سەلمانازاری سێیەم) شای ئاشووری بەسوپایەکی گەورە هاتە کوردستان بۆ شەڕکردن لەگەڵ (ماد و فارس)، بەڵام سەرنەکەوت، لەساڵی (٨٨٥)ی پ. ز هەمان شا ڕوویکردە هەرێمی (زاموا=سلێمانی ئێستا)، لەئەنجامدا گڵەزەردە و تاسلۆجەی گرت، وە لەساڵی (٨٨٤)ی پ. ز سوپایەکی ناردۆتە هەرێمی (نامرێ=پشدەری ئێستا) بەڵام لەدوای ماوەیەکی کەم گەڕاوەتەوە.

یۆنانیەکان لەمێژووی خۆیان ناوی (شائاریاس) دەبەن کە شەڕی لەگەڵ کردوون و دەوڵەتێکی مەزنی کوردی بنیاتناوە کە سوپایەکی زۆر و ئازای هەبووە، ئەو شایە دەوڵەتی ئاشووری ڕووخاندووە و شاری (هەنگادان=ئەکباتان=هەمەدان)ی کردۆتە پایتەختی دەوڵەتەکەی، بەڵام هەندێ مێژوونوس دەڵێن: (کساکسار=کواکسار) کە پاشایەکی دەسەڵاتداری کورد بووە، دەوڵەتی ئاشووری لەناوبردووە نەك (شائاریاس)، بەڵام (شائاریاس) لەگەڵ دەوڵەتی (بابل) جەنگاوە و سەرکەوتوو بووە.

لەساڵی (٨٤٢) پ. ز (تـەگلات ئـازاری دووەم) شـای ئاشـووری جـەنگێکی سـەختی لەگـەڵ کوردەکـان بـەرپاکردووە، (٦٠٠٠) کـوردی بـەدیل گرتـووە و بردونـی بـۆ (نەینـەوا) پایتـەختی دەوڵەتەکەی. لەشەڕێکی تردا سەرکردەی سوپای ماد (دخۆ) کە یۆنانیـەکان بـە (دیـاکۆ) ناویدەبـەن بـەدیل گـیرا و لەگـەڵ (٤٤١) پیاوی ناوداری کورد دوورخرانەوە بۆ وڵاتـی (شامات=سوریا) و لەشەڕێکی تردا وڵاتی مادی گرت.

لەسـاڵی (٨٠٠)ی پ. ز (کـاردون پاشـا)ی کـورد لەگـەڵ (سەنحاریب شا) کەوتە شەڕ و لەئەنجامدا وڵاتی بابلی داگیرکرد و زۆر لەسوپای (سەنحاریب) کـوژران و بـەدیل گـیران. لـەمێژووی (٧٧٥)ی پ. ز (ئەسارهادون کوڕی سەنحاریب) کەوتە شەڕ لەگەڵ (مـاد و فـارس) لەئـەنجامدا سـەرکەوتن، تـاکو هـاتنی (ئاشـوور پانیپاڵ) بابلیەکان لەژێر دەستی ماد و فارسدا بوون، لەم کاتـەدا کۆمەڵێك بەناوی (ئاسکا) لەژووورووی وڵاتی ئاشوور سەریانهەڵدا، هەموو ئاسیای بچوکیان داگیرکرد و لەسنووری دەوڵـەتی ئاشوور دەسـتیانکرد بـەتاڵان و کوشـتن و وێرانکـاری دەوڵـەتی ئاشـوور، بەدامرکاندنەوەی ئەوان خەریك بوو و دەسەڵاتی کزبووبوو.

بەنرخ و چەك و جبەخانەی سەربازیان دەستبەسەراگرت و ولأتی ئاشووریان لەنێوان خۆیاندا بەشکرد، (کەیکاوس) کچی کوڕی خۆی دا بەکوڕی شای (بابل)، ئەوکاتە دەوڵەتی کوردی لەدەریای ناوەڕاستەوە تاکو ڕۆژهەلأتی پاکستان و ئەفغانستان لەژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی کوردیدا بوو، لەساڵی (٥٨٦)ی پ. ز (کەیکاوس)مرد، (ئەستیساکی) کوڕی بوو بەپاشای مادستان، ئەم شایە دەستیکرد بەشتی نالەبار و گوێنەدان بەیاسا و دابونەریتی کۆمەڵ و دژی بەرژەوەندی گشتی.

(کۆرشی گەورە) پاشای دەوڵەتی فارس لەهەلێك دەگەڕا بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی ماد، سوپایەکی زۆر و پڕچەکی ئامادەکرد و هێرشی هێنایە سەر ولأتی میدی و ئاگری جەنگ لەنێوان سوپای کورد و سوپای فارس هەڵگیرسا، لەوکاتەدا سەرۆك هۆزێکی کورد کە ناوی (پوازەك) بوو هەڵگەڕایەوە و چەکی خیانەتی هەڵگرت و چووە ناو سوپای فارس، بەمجۆرە بەهۆی خیانەتی هەندێ نامەرد و خۆفرۆش دەوڵەتی ماد لەساڵی (٥٥٠)ی پ. ز ڕووخا و کەوتە ژێردەستی دەوڵەتی فارس بەسەرۆکایەتی (کۆرشی ئەخمینی). (کۆرش) دەستیکرد بەلاواندنەوە و ڕێزلێنانی گەلی میدی لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی و بەکوشتدانیان و بەگژدانیان دژی دوژمنانی دەوڵەتی فارس.

بەمجۆرە دووسەد ساڵ گەلی میدی لەلایەن دەوڵەتی فارسی چەوسایەوە و کرابووە کۆیلە، لەئەنجامی ئەمەدا کە تووشی گەلی میدی بووبوو، هەندێ نیشتمانپەروەرانی میدی کەوتنەخۆ بۆ

کەوتە جەنگ و لەم جەنگەدا (دارا) خۆی هەڵات و ژن و منداڵی کەوتە دەستی (ئەسکەندەر).

لەساڵی (٣٢١)ی پ. ز سوپایەکی تێکەڵاو لەکورد و فارس هاتنە سەر سوپای (ئەسکەندەر) و وڵاتی مادیان لەژێر دەست دەرهێنا، (دارای سێیەم) کە دوازدەمین پاشای (ئەخمینی) بوو لەساڵی (٣٢٠)ی پ. ز بوو بەپاشای کوردستان و ئەرمینیا و لەوکاتەوە کوردستان ناونرا (کوردوانەن). کاتێك کە سوپای (ئەسکەندەری ماکدۆنی) وڵاتی میدی داگیرکردبوو، کە کچە شۆخەکانی میدی دەردەکەوتن ئەفسەر و سوپای (ئەسکەندەر) پێیان دەوتن (ئافرۆدێت) واتە (شای جوانی) لەوکاتەوە وشەی (ئافرەت) بۆ ژنی کورد بەکارهاتووە کە لەوشەی (ئافرۆدێت) وەرگیراوە کە لەبنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانی‌یە، لای یۆنانیەکان (ڤینۆس و ئافرۆدێت) هەردووکیان بەواتای (خوای جوانی) هاتووە.

لەساڵی (٣٣٠)ی پ. ز (سەلفەکوسەکان) هێرشێکیان هێنایە سەر کوردستان و داگیریانکرد، بەڵام هەندێ مێژوونوس دەڵێن: هەر لەوکاتەدا لە (ئاتروپاتین=ئازەربایجان) دەوڵەتێکی بچوکی کورد دروستکرایەوە، لەساڵی (٣٣٥)ی پ. ز وڵاتی ماد کەوتە ژێردەستی ئەفسەرێکی سوپای (ئەسکەندەر) کە ناوی (سەلەقوس) بوو، لەدوای ئەو کەوتە بەردەستی ئەفسەرێکی تر بەناوی (ساتراب). لەدوای مردنی ئەسکەندەر لەساڵی (٢٧٥)ی پ. ز کوردستان کەوتە ژێردەستی (ئەرمەنیەکان) کە

دوباره سوپا بهێننەوە سەر دەوڵەتی فارس و کوردەکان یارمەتی ئەدەن، ئەنتوان دوباره سوپایەکی زۆری هێنا بۆ سەر فارسەکان و کوردەکانیش یارمەتی ڕۆمەکانیاندا، لەئەنجامدا فارسەکان شکان.

لەساڵی (٣٤)ی پ. ز (ئەردەشێر ساسانی) سنووری دەوڵەتی ساسانی زۆر فراوانکرد، زۆربەی زۆری وڵاتی ماد و وڵاتی فارسی خستە ژێردەستی خۆی. هەندێ لەمێژوونوسان دەڵێن: ساسانیەکان لەڕەگەزدا کوردن، ساسانیەکان ئاینی زەردەشتیان کردە یاسای دەوڵەت و وڵاتی کوردستان بەتەواوی کەوتە ژێردەستی ساسانیەکان. لەپێش داگیرکردنی وڵاتی فارس و کوردستان لەلایەن داگیرکەرانی ساسانی لەساڵی (٥٣)ی پ. ز لەڕۆژگاری پاشای سێزدەهەمی ئەشکانی فارسی شەڕێکی سەخت لەنێوان فارس و ڕۆمدا لەسەر خاکی میدی ڕوویدا، سەرکردەی سوپای ڕۆم (کراتوسی) کوژرا، سوپای ڕۆم شکا و زۆری لێکوژرا، لەساڵی (١)ی پ. ز دوباره لەنێوان سوپای فارس و ڕۆم پەیمانی ئاشتی مۆرکرا، کوردستان و ئەرمەنستان درایە دەوڵەتی ڕۆم.

لەساڵی (٣١)ی زایینی سەرداری ڕۆما ئاییینی مەسیحی کردە ئاییینی دەوڵەت، بەم هۆیەوە شەڕی نێوان فارس و ڕۆم بوو بەشەڕی ئاییینی سیاسی، دەوڵەتی فارسیش لەبەرامبەر ئەمەدا دەستکاری ئاییینی زەردەشتی کردووە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی ئەم ئاییینەی گۆڕیوە و بەسەر گەلی میدیدا سەپاندوە، ئەگەرچی میدیەکان هەر لەسەر ئایینی ڕاستەقینە بوون، هەروەها

دوو سوپای ڕۆم لەکوردستان یەکتریان گرتەوە، هەردووکیان گەمارۆی شاری (مەدائین)ی پایتەختیاندا، بەلاّم بۆیان نەگیرا و گەڕانەوە کوردستان، لەگەڕانەوەیاندا تووشی سوپای فارسی بوون و جەنگ هەلّگیرسایەوە و سەرکردەی سوپای ڕۆم کوژرا، لەبەرئەوە دەولّەتی ڕۆم داوای ئاشتی لەفارسەکان کرد و لەئەنجامی ڕێکەوتنامەیەك لەنێوانیاندا کوردستان و ئەرمەنستان درایە دەولّەتی فارسی، بەلاّم لەسەردەمی (شاپوری سێیەم)ی فارسی، ئەرمەنستان نیوەی درایەوە ڕۆمەکان.

لەسالّی (٣١٣)ی زایینی لەسەردەمی (بەهرامی چوارەم) شای ساسانی (خوسرەوی ئەرمەنی) یاخیبوو، بەلاّم شای ساسانی ئەم یاخیبوونەی دامرکاندەوە، هەر لەو ماوەیەدا کورد سێ ڕاپەڕینی کرد لەدژی دەولّەتی فارسی، بەلاّم هەموویان دامرکاندەوە و کورد تووشی دەربەدەری و کوشتن و تالاّن بووە. لەسالّی (٤٢٠)ی زایینی لەسەردەمی (بەهرامی گۆرد) دیسان کوردەکان ڕاپەڕینەوە، بەلاّم سەرکوتکران.

لەسالّی (٥٠٣)ی زایینی، شەڕ لەنێوان فارسەکان و ڕۆمەکان لەکوردستان دەستپێکردەوە لەناوچەی جزیرەی بۆتان و کوردستانی خواروو. (خوسرەوی یەکەم=ئەنوشیروان) لەسالّی (٥٧٠)ی زایینی هات بۆ کوردستان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی (کورد و خەزەر) لەوکاتەدا قەیسەری ڕۆم بەسوپایەکی زۆرەوە ڕوویکردە کوردستان و کەوتە شەڕ لەگەلّ سوپای فارس، ئەم شەڕە پێنج سالّی خایاند، لەسالّی (٦٠٠)ی زایینی (قوبادی

هەرێمی (شارەزوور و سیروان و پاوە و پشدەر و تکریست و حەلوان) کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سوپای ئیسلام.

لەساڵی (٤٩٥)ی کۆچی ئەم دەوڵەتانەی خوارەوە دروستبون، کە زۆربەی زۆری مێژوونوسان بەکوردیان دادەنێن:

١-دەوڵەتی (ئەرتەکیە) کە لە(ماردین و حصن کیف) دروستبوو، بوو بەفەرمانڕەوای وڵاتی کورد، نزیکەی سێسەد ساڵ حوکمی کردووە، بەهۆی (قەرەقۆینلو) لەناوچووە.

٢-دەوڵەتی (شائەرمەن) لەناوچەی (ئەخان) دروستبوو، ئەیبوبیەکان ئەم دەوڵەتەیان ڕووخاند.

٣-دەوڵەتی (زەنگی) کە فەرمانڕەوای (موسڵ و هەولێر و سنجار و سوریە) بوو، ئەم دەوڵەتەش هەر بەهۆی (ئەیبوبیەکان) لەناوچوو.

لەساڵی (٥٤٠)ی کۆچی لەئازەربایجان دەوڵەتی (ئەتابویکە) دامەزرا، ئەویش (خوڕازمیەکان) ڕووخاندیان، دەوڵەتی (ئەتابویکە) لەدوای ڕووخانی دوبارە لە (لوڕستان) دامەزرایەوە، ئەویش (تەیموری لەنگ) ڕووخاندی، بەڵام هەندێ مێژوونوس دەڵێن ئەم دەوڵەتە تاکو سەردەمی (پەهلەویەکان) هەر فەرمانڕەوا بوون.

لەساڵی (٥٤٨)ی کۆچی دەوڵەتی (ئەیوبی) بەسەرکردایەتی (سەلاحەدینی ئەیوبی) دروستبوو، کە کورد بوو. لەساڵی (٦٢٧)ی کۆچی سوپای ڕۆم ڕوودەکاتە هەرێمی شارەزوور، کە ئەوکاتە سەرکردەی هەرێمەکە (خەسرەوی پەروێز) بوو، سوپای

تاجانی لەکتێبی (شعلة في درب التأريخ)دا دەنوسێت: نازانم دەوڵەتی (خورشیدی خاوەر و دەوڵەتی بەهرامی لۆلۆیی) بۆچی تا ئێستا مێژوو باسینەکردوون. دەوڵەتی (خورشیدی خاوەر) کە بەدەگمەن مێژوو باسی ڕووداوەکانی کردووە، تەنها هەندێ سەرچاوە نەبێ وەکو: (شعلة في درب التأريخ) نووسینی مامۆستا مەلا ئەحمەدی تاجانی، ستارەی تابان، مامۆستا مەحمودی حەمامیان، (تهذيب التأريخ)–مامۆستا مەلا عەبدولقادری باڵەکی، (بحث عن منطقة بيتواته)–مامۆستا مەلا فەتحوڵلا هەرتەلی، وە هەروەها کتێبی (کوردنامە)ی ئاغا بەهاری موکریانی و هەندێ دانراو و نوسراوی تر.

بەڕاستی جێگای خۆیەتی گەلی کورد شانازی بەو کەڵە پیاوانەوە بکات کە لێنەگەڕاون مێژووی دەوڵەتێکی وا فراوان و بەهێز لەناوبچێت و نەوەکانی ئەمڕۆمان بێئاگا نەبن لێی و بەڵکو هەردەم ڕەگی لەناو مێژوودا بمێنێتەوە. بۆئەوەی بەڕوونی مێژووی دەوڵەتی (خورشیدی خاوەر) بخەینە سەر لاپەڕەکانی مێژوو، پێویستە بەر لەهەموو شتێك باسی شارۆچکەی (بێتواتە) بکەین کە پایتەختی دەوڵەتی (خورشیدی خاوەر) بووە.

مامۆستا مەلا فەتحوڵلا هەرتەلی دەڵێت: پایتەختی ئەم دەوڵەتە کوردیە شارۆچکەی (بێتواتە) بووە. دەربارەی هەڵکەوتنی گوندی (بێتواتە) و ماناکەی مامۆستا مەحمودی حەمامیان دەڵێت: (شارۆچکەی بێتواتە لەهەرێمی خۆشناوەتی هەڵکەوتووە، دەوروبەری شاخی بەرز و سەرکەشە و خوارووی دەشتی

بەفەرمانڕەوا و ناویان لەگوندی سوباریا نا (زەماوەند) بەناوی کچی (تیرکان). ئەنجا (زەماوەند) بوو بەناوی شارۆچکەی (سوباریا=بێتواتە) ئێستاش لەبەرامبەری گوندی بێتواتە جێگایەك هەیە بەسەر چۆم و باغاتی بێتواتەدا دەنوارێت پێی‌دەڵێن (زەمکێ) کورتکراوەی وشەی (زەماوەند)ە لەکاتی خۆی (زەماوەندخان) هاوینان کەپر و ساباتی لەوێ کردووە، ئێستاش شوێنەواری دیوارەکانی ماوە کە بەبەردی گەورە گەورە دانراوە).

دەربارەی وشەی (بێتواتە) مامۆستای ناوبراو دەڵێت: وشەی (بێتواتە) بەواتای (گۆڕستانی پیرۆز) هاتووە، چونکە کاتێك ئایینی حەزرەتی مەسیح (د. خ) لەو هەرێمەدا بڵاوبووە، قەشەیەکی پایەبەرز لە (بێتواتە) مردووە لەگۆڕستانی بەر (بێتواتە) نێژراوە لەبەر پیرۆزی ئەم قەشەیە مەسیحیەکان کە یەکێکیان لێ‌دەمرد دەیانهێنایە ئەم گۆڕستانە، کە ئێستاش ئەم گۆڕستانە هەر ماوە و گۆڕەکانی ڕووەو ڕۆژهەڵاتن واتە (مەسیحین). هەندێ مێژوونوسان دەڵێن: وشەی بێتواتە واتە (جێگەی بت)، چونکە کۆمەڵێك لەهۆزی (تەم) بتێکیان دەپەرست بەناوی (خامەسون) ئێستاش جێگایەك لەپشتی بێتواتە هەیە بەناوی دۆڵی (خەمسون). هەندێکیش دەڵێن: وشەی (بێتواتە) زمانی ئارامیە بەواتای (جێگەی فێنك) هاتووە، بەڵام ئاغابەهاری لەکتێبی (کوردنامە)دا دەڵێت: وشەی (بێتواتە) وشەیەکی ڕەسەنی (ماد)یە بەواتای (گردۆڵکە) هاتووە.

## دامەزراندنی دەوڵەتی خورشیدی خاوەر

مامۆستا ئەحمەدی تاجانی لەکتێبەکەیدا دەڵێت: (خورشیدی کوڕی ئەردەشێری کوڕی یەزدی گوردی کوڕی نەریمان کوڕی بەهمەنی میدی) بوو، لەتیرەی (سیماشکی) سەر بەهۆزی (لوڕ)ە. لەشاری (ئەکباتان=هەمەدان) لەدایکبووە. (مێژووی لەدایکبوونی نەزانراوە)، خورشیدی خاوەر لەلایەن (سوهراب) شای ئێران کرابوو بەکاربەدەستی هەرێمی (ئەکباتان) بەهۆی مرۆڤایەتی و لێهاتوویی و ڕەوشت بەرزی، زۆربەی زۆری هۆزەکانی (مید)ی لەدەوری کۆبوبونەوە، جێگای بڕوای شای (ئێران)یش بوو، بۆ هەموو کاروباری دەوڵەت و لەهەموو کۆڕ و کۆبونەوەیەکدا باسی مەردایەتی (خورشید) دەکرا، تا لەناو گەلی فارسیشدا زۆر خۆشەویست بوو، لەبەرئەوە (سوهراب شا) لێی کەوتە گومان و ویستی پیلانی لەناوبردنی بۆ بنێتەوە لەبەر مەترسی دواڕۆژی خۆی، بەڵام لەبەرئەوەی (خورشید) زۆر خۆشەویست بوو لەناو گەلی ئێران بەگشتی و بەتایبەتی لەناو گەلی (میدی).

هەموو سەرۆك هۆز و پیاوە جوامێرەکان (خورشید)یان بەسەرکردەیەکی دڵسۆز و ئازا دادەنا، لەبەرئەوە شای ئێران نەیویست ڕاستەوخۆ (خورشید) لەناوببات، بەڵکو دەیویست بەنهێنی پیلانێك بۆ لەناوبردنی دابنێ. بۆ ئەم مەبەستە بەنهێنی و بێئاگاداری کەس شەو لەگەڵ (کەی ئاپۆ)ی ئەمینی نهێنیەکانی شا کۆبونەوەی کرد و ئەم نیازەی لای دەربڕی، دوای وتووێژێکی

جێبەجێکردنی فەرمانی شای ئێران زەمین، بەدڵسۆزی گیانم بەختبکەم).

شا کە ئەمەی بیست وایزانی لەپیلانەکە سەرکەوت و فەرمانیدا شمشێرێکی دەسك زێڕ و ئەسپێکی ڕەسەنی بدەنێ و بەڵێنیدا بە (کواکسار) پلەی گەورە و مەزنی بداتێ لەبەرامبەر دڵسۆزی بۆ ئەم پیلانە گلاوەی لەدژی (خورشیدی خاوەر). کواکسار گەڕایەوە بۆ (ئەکباتان) و بەپەلە کۆبونەوەی لەگەڵ (خورشید)ی ئامۆزای کرد و لەپیلانەکە ئاگاداری کردەوە و ئامۆژگاری کرد کە ئاگاداری خۆی بێ لەفێڵی (سوهراب) شای فارسەکان.

خورشید زۆربەی زۆری سەرەك هۆز و پیاوماقوڵانی (مید)ی کۆکردەوە لەناوەڕۆکی پیلانی (سوهراب)ی ئاگادارکردنەوە و پێی ڕاگەیاندن: ئێوەی بەڕێزی نەتەوەی (کەیقوباد) و (کەیخوسرەو)ی میدی بڕیارتان چییە؟، وتیان: (تۆ چی بڕیار دەدەی ئێمە پشتگیری لەبڕیارەکەت دەکەین و لەخۆشی و ناخۆشی، لەشەڕ و ئاشتی لەژێر فەرمانی بەڕێزتانین). بەمجۆرە خورشید پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت و شای ئێران بڕی و سوپایەکی ئازا و پڕچەکی لەلاوانی میدی دروستکرد و خۆی کردە فەرمانڕەوای (ئەکباتان) و دەوروبەری، وەکو نیمچە دەوڵەتێکی سەربەخۆ نزیکەی ساڵێك فەرمانڕەوایی ناوچەکەی کرد.

دوای ساڵێك سوهراب سوپایەکی زۆر و بەهێزی ئامادەکرد بەسەرۆکایەتی (فولادتەن) و ناردی بۆ سەر (خورشید) کاتێ سوپای (فارس) گەیشتە نزیك هەرێمی (ئەکباتان). سوپای میدی

گردەکە گۆڕەپانە هاوینان (خورشید) لەسەر ئەم گردە ساباتی کردووە و ئێستاش پێی‌دەڵێن (گردی خورشید).

کاتێك (سوهراب شا) زانی (خورشید) لەلایەن (پیرانشا)وە وەرگیراوە نامەیەکی بەهەڕەشەی بۆ (پیرانشا) نارد و داوای لێکرد کە خورشید دەربکات، دەنا سوپایەکی بێژمارە دەنێرمە سەرتان و لەوڵات دەرتدەکەم. پیرانشا ناردی بەدوای خورشید و سوپاکەی، ناوەڕۆکی نامەکەی سوهرابی پیٚ‌ڕاگەیاندن، ئنجا خورشید هەموو سوپاکەی و پیاوماقوڵانی میدی کۆکردەوە و دوبارە نامەکەی سوهرابی بۆ شیکردنەوە و ئەم وتارەی خوارەوەی خوێندەوە:

(تەتەهو ئاهو ڕاموزدە) واتە (بەناوی خوای چاکەویست)

ئەی بەچکە شێرانی میدی... ئەی جوامێران... ئەی ئەفسەر و کەیخودایانی سوپای میدی ئەکباتان... ئەی پاڵەوانانی نەتەوەی (بەهمەنی سیماشکی لوڕی).

ناتوانم بەوتە ئەو سوپاسەتان بکەم کە شایان بێت بەئێوەی جوامێر، بەڕاستی ئەوپەڕی شکۆمەندیە کە ئێمە لەسەر خاك و ولاتی خۆمان دەربەدەر کراوین، ئێستاش ئێمە لەگەڵ پیرانشا هەردووکمان بەڕەگەز لەنەتەوەی مادین، ئەگەر لەدژی بوەستین ئەبیٚ شەڕی براکوژی بکەین کە لەبەرژەوەندی دوژمنانمان تەواو دەبیٚ و بەزیانی خۆمان کۆتایی دێت.

ئێوەی بەڕێز ئەبیٚ بزانن ئەگەر ئێمە لەهەرێمی لاجان نەڕۆین سوپای سوهراب دێت و کوشتن و سوتان و وێرانکاری و دەربەدەری تووشی دانیشتوان دەبیٚ، لەبەرئەوە من وەکو

لەبەرئەوە کەوتە ئازاردانیان بەجۆرێك ژیانیان تاڵ بووبوو، بەدزی چەکیان پەیداکرد و هەموویان بەڵێنیاندا بۆ ڕزگاری گەل و خاکی میدی سەروماڵیان بەخت بکەن.

سوپای میدی بەسەرۆکایەتی (گەندەش شا)ی میدی کە دەکاتە بابەگەورەی ڕەگەزی (سماشکی)، ئەم سوپایە لەگەڵ سوپای (فارس) کەوتە جەنگ لەدوای کوشتارێکی زۆر لەهەردوولا، سوپای فارس شکا و وڵاتی میدی لەدوژمنان پاککرایەوە. گەندەشی میدی سنووری دەوڵەتەکەی فراوانکرد بەمجۆرەی خوارەوە:

لای خوارەوە تاکو شاری (ئیستو=هیت)، لای سەرووی تاکو ڕووباری (ئاراکس=ئاراس)، لای ڕۆژهەڵات تاکو نزیکی سەند و بەنجاب، لای ڕۆژئاوا تاکو (شاپار=ئەسکەندەرونە). بەڵام لەبەرئەوەی نەخۆشی تاعون لەناو سوپای میدی بڵاوبووەوە لەدۆڵی (ئادگەنە و پورانین) زۆربەی سوپاکە بەتاعون مردن، ئەوەی مابوو بەکەناری (دەلەمون=بەحرێن) گەڕانەوە دەوروبەری (ئەکباتان) لەوماوەیەدا (گەندەش) شای میدی مرد و (ئاگومی یەکەم) کە خزمی بوو، بوو بەپاشای (مادستان) دوای ماوەیەك (ئاگومی دووەم) بوو بەشای مادستان، ئەم شایە بەسوپایەکی زۆرەوە هاتەسەر وڵاتی (بابل)، لەدوای جەنگێکی خوێناوی شای بابل کوژرا و سوپاکەی شکا و وڵاتی بابل تووشی سوتان و تاڵان بوو.

دوانزه مانگ سوپای میـد شـەڕی مەردانـەی کـرد و بـەرگری لەگەڵ و وڵات کرد، بەڵام بەهۆی ئەوەی هەندێك سەرۆك هۆزی ماد هەڵگەڕانەوە و چەکی نامەردیان هـەڵگرت و چوونـەپاڵ دەوڵـەتی فـارس. لەبەرئـەوە سـوپای میـدی شـکا و هـەمووومان بـەماڵ و خێزانەوە هاتین بۆ هـەرێمی (لاجان) بۆلای (پیرانخـان)ی میـدی، ئەویش زۆر مەردانە وەریگرتین، بەڵام دەوڵـەتی فـارس هەڕەشەی بۆ نارد کە ئەبێ ئێمە دەربکات لەهەرێمی لاجان، منیش نەمویست ببمە هۆی شەڕ و دەربەدەری خەڵکی وڵاتی لاجان.

لەبەرئەوە سوپا و ماڵ و خێزانم کۆکردۆتەوە و دەمەوێت بێمـە ژێـر سـێبەری دەوڵـەتی (لۆلـۆ) لەهـەرێمی (زامـوا=دەربـەندی بابیت=دەربەندی بازیان) کە ئێمـە هەموومان ڕەگەزمان میدیـە و نەوەی (ئارین). ئەمە دەقی نوسراوی (خورشیدی خاوەر)ە کـە بۆ شای (لۆلۆ) نوسیویەتی دەڵێن: (ئەم نامەیـە لەپێسـت نوسـراوە و ئێستا لەعەنتیکەخانەی تاران هەیە).

ئاغـا بـەهاری موکریـانی لـەکتێبی (کوردنامـە)دا دەڵێـت: (خورشید) برایـەکی گـەنج و جوان و ئازای هـەبوو نـاوی (کـادی) بـوو، ئەوکاتـەی کـە لەدەشـتی (لاجـان) بـوون (زێڕینـا) کاهینـەی پەرستگە، کچێکی قەشەنگ و جوان بوو، لەگەڵ (کادی) گرفتاری ئەوینی یەکتربوون (زێڕینا) لەگەڵ (خورشید) کەوت و پەرستگەی (زەرکەتانی) جێهێشت. هـەروەها (خوبیـار) کـاهینی پەرسـتگەی ناوبراو بوو، ئەویش کەوتەگەڵ سـوپای میـدی. مامۆسـتا هەرتـەلی لەکتێبەکـەیدا دەڵێـت: شـای (لۆلـۆ) هـەموو پلـەدار و پیـاوە

**یەکـەم:** سوپای خورشید هاوبەشی سوپای (لۆلۆ) بێت بۆ بەرگریکردن لەخاك و وڵات و کاتی پێویست.

**دووەم:** خورشید و سوپاکەی بەبێ فەرمانی شاهانە دەست لەکاروباری وڵات وەرنەدەن.

**سێیەم:** خورشید و سوپاکەی ئەبێ ئایینی ئێمە قبوڵ بکەن.

شا و ئامادەبووان ئەمانەیان زۆر لا پەسەند بوو، شا مەرخەش بەم مەرجانە وەڵامی (خورشید)ی ناردەوە. کاتێك خورشید نامەکەی شا مەرخەشی پێگەیشت لەکۆبونەوەیەکی گشتی سوپا و خەڵکەکەی، نامەکەی بۆ خوێندنەوە و بەم مەرجانە ڕازیبوون. بەمجۆرە خورشید و سوپاکەی وڵاتی لاجانیان جێهێشت و بەوڵاتی (ئامری=پشدەر)دا کەوتنەڕێ بەرەو دەوڵەتی (لۆلۆ)، وەختێ لەهەرێمی زاموا نزیکبوونەوە شا مەرخەش و ئەفسەران و کاهینان و پیاوماقوڵان پێشوازیان لێکردن و دوای دامەزراندنی ماڵ و خێزانیان دەوڵەتی لۆلۆ، خورشید و سوپاکەی ناردە هەرێمی (سۆباریا=بێتواتە)، خورشیدی خاوەر و کادی برای و زێرینای کاهینە و خوبیاری کاهین و سوپاکە کەوتنەڕێ بەرەو هەرێمی (سوباریا) کە گەیشتنە دەشتی (نارین=بیتوێن) خورشید تەماشایکرد جێگایەکی خۆش و گونجاوە، خورشید سوپاکەی لەدەشتی نارین دامەزراند و خۆی و چەند ئەفسەر و پیاوماقوڵ چوون بۆ سۆباریا.

خەڵکی ناوچەکە زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێکردن، خورشید بارەگای خۆی لەسوباریا دانا و خەریکی ئاوەدانکردنەوە و

(سوباریا=بێتواتە) دوو بەرەبابی لێبوون هەردووکیان لەڕەگەزی میدی بوون، یەکیان بەناوی (گۆتی) و ئەویتریان بەناوی (سۆباری)، ئەوانەش پاشماوەی ئەوانە بوون کە لەکاتی هێرشی پاشای سۆمەری (ئۆتۆحیکال) بەسوپایەکی زۆر ناوچەی (سۆباریا) و دەوروبەری داگیرکرد و دەستیکرد بەکوشتن و وێرانکاری، ئەوانەی لەم داگیرکاریە ڕزگاریان بوو لەکێوەکانی دەوروبەری (سۆباریا) گیرسابوونەوە، کاتێ (سۆمەریەکان) گەڕانەوە خوارووی عێراق ئەوانیش گەڕانەوە (سۆباریا) و دەستیانکردەوە بەکاروباری خۆیان.

(تیرکانشا) کە شای گۆتی بوو لەگوندی (هەرمك)ی ئێستا دادەنیشت کە گوندێکە لەڕۆژئاوای (سۆباریا) نزیکەی (٤٠)کم دوورە لێی، بەڵام ئەم شایە حوکمڕان نەبوو، چونکە فەرمانڕەوای ئەم هەرێمە پاشای لۆلۆ بوو، (ئۆتۆحیکال) ڕوویکردە ئەم شارۆچکەیە؛ بەڵام تیرکان خۆی نەگرت بەرامبەر ئەم هێرشە و هاتە شارۆچکەی (ئارمۆتە=هەرمۆتە) لەخوارووی شاری (کۆیێ)ی ئێستا، ئێستاش هەموو دانیشتوانی لەسەر ئاییني مەسیحین، مەزهەبی (کاثولیك)، بەڵام بەفەرمانی قەشە پۆڵسی (تیرکان) درایە دەستی شای (سۆمەری) و شا بەدەستی خۆی کوشتی. ئێستاش لەگوندی (هەرمك) شوێنەواری قەڵاتی (تیرکان) ماوە کە پێی دەڵێن (قەڵاتی تیرەگۆتی) یان (تیرکانی گۆتی) لەسەرووی گوندی (هەرمك) ئەشکەوتێکی دەستکردی لێیە بەناوی (ئەشکەوتی تیرکان).

بەهرام شا کاتێك نامەی خورشیدی خوێندەوە، بەگەرمی بەخێرهاتنی کادی کرد و سوپاسی خورشیدیشی کرد. کادی خۆی و چەند ئەفسەر و سەربازێك دەستیکرد بەگەڕان بۆلای سەرۆك هۆز و گەلی زاموا، دوای گەڕانێکی زۆر گەڕایەوە لای (بارام شا) و لەکۆبونەوەیەکی ئەفسەرانی سوپای دەوڵەت بەپێی توانا کێشە و گیروگرفتەکانی نێوانیان یەکلاکردەوە و کادی گەڕایەوە بۆ (سۆباریا=بێتواتە).

زۆری نەخایاند پاشای (عیلام) کە ناوی (سڵخاخا) بوو بەسوپایەکی زۆر و پڕچەك هێرشی کردەسەر دەوڵەتی (لۆلۆ)، خورشید کە بەمەی زانی سوپایەکی زۆری کۆکردەوە و بەسەرکردایەتی (کادی) ناردی بۆ پشتیوانی سوپای (بارام شا) دژی عیلامیەکان، کادی لەلایەن (بارام شا)ەوە کرایە سەرکردەی گشتی سوپای (لۆلۆ)، دوای شەڕێکی سەخت سوپای (عیلام) شکا و گەڕایەوە ولاتی خۆی.

زۆری نەخایاند (سڵخاخا) مرد و لەگۆڕستانی شاهانە لەشاری (شوش) کە پایتەختی دەوڵەتی (عیلام) بوو نێژرا، دوای ئەو کوڕەکەی کە ناوی (هالو=هەڵۆخان) بوو لەجێگای بوو بەشای (عیلام) ئەویش وەکو باوکی بەهیوای ڕووخاندنی دەوڵەتی (زاموا) بوو، بۆیە بەسوپایەکی زۆرەوە هێرشی کرد، بەڵام ئەویش بەزیانێکی زۆر گەڕایەوە بەدەشتی لاجاندا، کاتێ گەیشتە سەر ڕووباری (لاوێن) کە دەوروبەری هەمووی دەشت و مێرگ بوو، هەڵۆخان فەرمانیدا سوپاکە لەوێ بحەسێتەوە، کاتێك هەڵۆخان

خاك و گەلی مادستان دەزانین، وە ڕێز و خۆشەویستی ئێوە لەدەروونی هەموو کەسدا جێی خۆی کردۆتەوە، لەبەرئەوە من ئامادەم تاجی شاهانەی دەوڵەتی لۆلۆ پێشکەش بەبەڕێزتان بکەم و خۆشم بەسەربازێکی دڵسۆزی دەوڵەتی لۆلۆ بزانم.

لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر و ڕەزامەندی ئامادەبووان خورشید بوو بەشای دەوڵەتی (لۆلۆ) و بارام شاش بوو بەوەزیری (خورشید)، دوای ماوەیەك خورشید پایتەختی دەوڵەتەکەی گواستەوە بۆ شارۆچکەی سۆباریا، لەبەرئەوەی خورشید دایکێکی زانا و ئازای هەبوو ناوی خاوەر بوو، ناوی سۆباریای گۆڕی و کردی بە(خاوەر زەمین). لەو ڕۆژەوەی (خورشید) بوو بەپاشا، زیاتر دەستیکرد بەخزمەتی گەل و وڵات و چاککردنی کشتوکاڵ و جۆگەلێدان و ئاوهێنان بۆ گوندەکان و چاککردنی ڕێگەوبان و قەدەغەکردنی بڕینی داری تەڕ و کوشتنی باڵندە و گیانلەبەری کێوی و فەرماندان بەدانانی ڕەز و باغ، وە چەند پەرستگەی یەزدان پەرستی دروستکرد لەگوندەکانی دەوروبەری (خاوەرزەمین)، وە هەروەها مافی ژنی دا کە بۆ خۆی مێرد هەڵبژێرێ بەزۆر مارە نەکرێت، وە موچەی بۆ کاهینەکان و بەساڵاچوان و پەککەوتەکان بڕیەوە، وە هەروەها بەگونجی گڵین ئاوی هێنایە ناو پەرستگە و شوێنە گشتییەکان (ئێستاش زۆرجار ئەم گونجانە لەژێر گڵ دەردەکەون)، وە هەروەها چەند کەسی دەست ڕەنگینی تەرخانکرد بۆ دروستکردنی مافور و بەڕە و ڕەشماڵ و کارگەیەکی دروستکرد بۆ دروستکردنی ڕم و

سوودی لێوەردەگرێت ئەم ئەشکەوتە زستانان دەرگای دەگیرا بەهۆی پڕبوونی لەئاو، بەلاّم هاوینان دەرگای دەکرایەوە، ئەم کانیاوە تایبەت بووە بەماڵی (خورشید)، ئێستاش بەم ئاوە دەڵێن (ئاوی داك خاوەر)، لەناو ئەم ئەشکەوتەدا دیواری دەستکردی جوان جوان کراون کە هەرماون.

لەوکاتەی خورشیدی میسدی لە (خاوەرزەمین) بوو بەشا، لەدۆڵی (شاوریْ)ی نزیك (خاوەرزەمین) قەشەیەکی مەسیحی هەبوو کاروباری ئایینی و کۆمەلاّیەتی ناوچەکەی جێبەجیْ دەکرد و لەگوندی (نۆرە) دادەنیشت، ئێستاش ئەم گوندە هەربەم ناوەوە ماوەتەوە، لەم گوندە بناغەی قەلاّتێك ماوە پێی‌دەڵێن قەلاّتی (شائول شا)، وشەی (شاوریْ) لەناوی ئەم پاشایەوە هاتووە و وشەی (شائول) کراوە بە(شاور). ئەم قەشەیە لەگوندی (مێدێرە) دێرێکی بۆ کچان دروستکردبوو، وشەی (مێدێرە) واتە (دیر الراهبات) واتە (دێری ڕەبەنان).

خورشید بەخوبیاردا نامەیەکی بۆ (شائول شا) نارد و تیایدا داوای لێکردبوو یاسای دەوڵەت قبوڵبکەن و سەر بەدەوڵەتی (خورشید) بن، (خوبیار) نامەکەی برد بۆ (شائول شا)، ئەویش زۆر ڕێزی (خوبیار)ی گرت و داوای لێکرد هەفتەیەك ماوەی بدەن تاکو ڕاوێژ لەگەڵ کاربەدەستان و پیاوماقولاّن بکات، ئەنجا وەلاّمیان دەداتەوە. شائول شا لەڕۆژێکی دیاریکراودا (قەشە و مەتران و کاردینال و پیاوماقولاّن)ی کۆکردنەوە و لەناوەڕۆکی نامەکەی خورشید ئاگاداریکردن و وتی: پێش هەموو شتێك ئەبیْ

بین، بەمەرجێ یاساکە دژی ئایینی ئێمە نەبێ، ئایینی زەردەشتی و مەسیحی و بوزی و مەزدەسنی) بۆیان هەیە پەیڕەوی ئایینی خۆیان بکەن، بەمەرجێ دژی دەوڵەت نەبێ، زەردەشتی و مەسیحی بۆیان هەیە ژن لەیەکتری بخوازن و ژن بدەن بەیەکتری، هەروەها ئەبێ یاسای دەوڵەت بەیەکسانی بڕوانێتە مافی هەموو کەس.

ئەم پەیمانە لەسەر پێستی کارەکێوی نوسرایەوە، لەساڵی (١٩٢٥) لەگوندی (شەکەڵە) بەردێکی بازنەیی دۆزرایەوە کە هەردوو ڕووی بەخەتی بزماری نوسرابوو، هەمان ئەو پەیمانە بوو کە لەنێوان (خورشید) و (شائول شا) مۆرکرابوو، بەلآم (فەوزی بەرقی) کە تورك بوو ئەم بەردەی قۆستەوە و بردی بۆ تورکیا. وشەی (شەکەلە) کە ناوی گوندی (شەکەلە)یە، لەناوی قەشە (شاکل ئیلۆ) وەرگیراوە بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار بۆتە (شەکەڵە).

خورشید قوتابخانەیەکی دروستکرد کە کوڕ و کچ پێکەوە لەم قوتابخانەیەدا دەیانخوێند، خورشید یەکەم کەسە کە ڕێگای داوە کوڕ و کچ پێکەوە بخوێنن و مافی بەژن داوە وەکو پیاو بخوێنێ و خوێندنی کردە زۆری و خوشکی خۆی کە ناوی (پەریسا=پەری ئاسا) بوو ناردیە قوتابخانە، لەتەمەنی هەشت ساڵان، ڕۆژانە (پەریسا) لەگەڵ (لارەکین) کوڕی (خوبیار) دەچوون بۆ قوتابخانە و وانەی ئاڤێستایان دەخوێند کاتێك تەمەنیان گەیشتە شازدە ساڵان هەردووکیان گرفتاری ئەوینی یەکتربوون.

(خورشید)ی میدی، ئەگەرچی ڕەنگی ئالاّی دەوڵەتی ماد ڕەش و سپی بووە.

دەربارەی سکەی پارە (خورشیدی خاوەر) سکەی پارەی دروستکرد، لەڕوویەکی پارەکە وێنەی ئاگرێکی لێبوو کە دوو کاهین لەدەوری وەستابوون لەڕووەکەی تر وێنەی سەری (خورشید)ی لەسەربوو، لەخوار سەری خورشید بەخەتی (دین کوردە)ی ئاڤێستا ناوی (ئاهوڕامزدە) بەوردی نوسرابوو. لەساڵی (١٩٨٠)ی زایینی حکومەتی عێراق خەریکی چاککردنی ڕێگای بێتواتە بوو بەبلدۆزەر لەکاتی هەڵکەندنی زەوی کوپەیەك دۆزرایەوە دوو جۆر پارەی تێدابوو، یەکێکیان پارەی سەردەمی (عەبدولمەلیك کوڕی مەروان)ی ئەمەوی بوو کە ئایەتی قورئانی لەسەر هەردوولا نوسرابوو، پارەکەی تر پارەی سەردەمی (خورشیدی میدی) بوو، ڕوویەکی وێنەی خورشید و ڕووەکەی تری وێنەی ئاگرێك و دوو کاهین بوو، ئێستاش لەبێتواتە و گوندی (دواوە) ئەم دوو جۆر پارەیە لای خەڵك هەیە.

(خورشیدی مید)ی ڕاوێژکارێکی زانا و لێهاتووی هەبوو ناوی (مشۆك) بوو خەڵکی (نارین=بیتوێن) بوو، خورشید بۆ هەموو کاروباری دەوڵەت ڕاوێژی لەگەڵ دەکرد، مشۆك بەخورشیدی وت: پێویستە هەندێ سەرباز بنێری بۆ دامێنی کێوی (کاکان=کۆهان=کویێ)ی ئێستا کە شارێکی کۆنە و لەپارێزگای هەولێر هەڵکەوتووە، خورشید نزیکەی هەزار سەربازی نارد بەسەرۆکایەتی (قازبگ) ئەم سوپایە بەدەیان ئەشکەوتی لەم

## شوێنەواری قەڵاتی خورشیدی خاوەر لەگوندی بێتواتە

لەخوارووی قەڵای خورشید پارچە بەردێکی تەخت هەیە ڕەنگی شینی ئاسمانیە و لەشێوەی لاکێشەدایە و ڕووبەرەکەی نزیکەی (٩٠٠) مەتر چوارگۆشەیە، جێگەی کونکراوی داری خێوەتی لێهەڵکەندراوە، هاوینان خورشید و زیرەکان و کاریەدەستانی کابینەی دەوڵەت لەسەر ئەم بەردە خێوەتیان هەڵداوە، لەلای ڕۆژهەڵاتی ئەم بەردە پارچەیەکی لێکراوەتەوە دەڵێن: ئەوکاتەی کە سوپای ئاشووری چوار سەدە پێش زایین هاتۆتە بێتواتە ئەم پارچەیەیان لێکردۆتەوە و بردویانە، لەبەرئەوەی نوسینێکی زۆر لەسەر ئەم پارچە بەردە نوسراوە، بەڵام نەزانراوە نوسینەکە چی بووە، هەتا ماوەیەکیش لەمەوبەر ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان گەنجانی گوندی (بێتواتە و دواوە و ئەندێك) سێ ڕۆژ هەڵپەڕکێ و شاییان بەوتنی گۆرانی ڕەسەنی کوردی لەسەر ئەم پارچە بەردە دەکرد، ئێستاش ئەو قادرمە بەردینانە ماون کە لەسەرا و پەردەی خورشیدەوە هاتووە بۆ سەر تەختەکە و ماوەی نزیکەی (٢٠٠)م ئەبێ.

لەدەوری قەڵا و تەختەکەدا چوار جێگەی ئێشکچی لێیە، ئێستاش خەڵکی بەجێگەکە دەڵێن (باجگران)، لەخوارووی بێتواتە دۆڵێك هەیە بەناوی دۆڵی (خشتان) کە خشتی قوڕی لێسورکراوەتەوە بەئاگر، لەخوارووی تەختی خورشید شوێنەواری ئاشێکی ئاردهاڕین هەیە کە (سەرشین) دروستیکردووە و

ماوەتـەوە، ئـەم شـارۆچکەیەی ڕازانـدەوە بـەڕواندنی دار و گوڵـی ڕەنگاوڕەنگ وە لەژێر شاخەکە ئاوی بۆ شارەکە ڕاکێشا بەگونجی سوورەوکراو، ئێستاش زۆرجار خەڵك ئەو گونجانە ئەدۆزنەوە و پێیان دەڵێن (لولەی سیناخان)، لەسەر شاخی پشتی شارۆچکەکە شورەیەکی بەردی دروستکردبوو، ئێستاش شوێنەوارەکەی ماوە و پێی دەڵێن دیواری (سیناخان).

لـەناو سـوپای خورشـید ئەفسـەرێکی چـالاك هـەبوو نـاوی (هاروت) بوو (خورشید) سیناى دا بەم ئەفسەرە کە باپیرەگەورەی هـۆزی (هـەروت) بـوو، ئێسـتاش ئـەم هـۆزە هـەر لـەو هەرێمـەدا نیشتەجێن بەتایبەتی لەگوندی (هەرووتەکەون). خورشـید بـرای خـۆی (کـادی) کـرد بەسـەرکردەی گشـتی سـوپای دەوڵەتەکـەی، ئێسـتاش شـوێنەواری قەڵایـەك هەیـە بـەناوی (قۆنگـرەی کـادی) لـــــەخواروی قەڵاکـــــە دۆڵێـــــك هەیـــــە بـــــەناوی (بەستەقادی=بەستەکادی).

باسـی ئـەوەمان کـرد کـە (لارەکـین) کـوڕی (خوبیـاری وەزیـر) لەگەڵ (پەریسا)ی خوشکی خورشید گرفتاری ئەوینی یەکتر بوون و پـەیمانیان بەیـەکتر دابـوو بـۆ هاوسـەری، بـەڵام (پەریسـا) پەیمانەکەی شکاند و (لارەکـین)ی لـەبیرخۆی بـردەوە، (لارەکـین) چەند پیاوماقوڵی نـاردە داخـوازی (پەریسـا)، بـەڵام ڕازی نـەبوو لاری هـەبوو لەوەی ببێتە هاوسەری (لارەکـین)، چـەند جـاری تـر چوون بۆ خوازبێنی، بەڵام نە (پەریسا و نە خورشید و نە خوشکە گەورەکـەی) ڕازی نـەبوون لـێرەوە نێوانـی خورشـید و خوبیـار

(سیاپشت) مانای (پشت ڕەش)، ئێستاش پاشماوەی ئەم هۆزە لە (ئازەربایجان) هەر بەناوی (سیاپشت) ناودەبرێن.

کاتێك سوپای ڕۆم دەوڵەتی خورشیدی داگیرکرد، دەستیکرد بەتاڵان و سوتاندنی دێهات و کوشتنی خەڵکی بێتاوان و هەژار، لەوکاتەدا لەهەرێمی (ئۆرارتۆ=ورمێ) سەرکردەیەکی چالاکی میدی سەریهەڵدا کە ناوی (کەیقوباد) بوو کاتی خۆی لەسوپای (خورشید) ئەفسەر بوو، بەڵام لەبەر هەندێ هۆی نادیار وازیهێنابوو، خوێنی کوردایەتی نیشتمانپەروەری هانیدا کە جوڵە بکات و لەلاوانی میدی سوپایەکی پێکهێنا و ڕوویکردە هەرێمی (خاوەرزەمین) لەبەرەبەیانێکدا سوپای (کەیقوباد) هێرشی بردەسەر سوپای ڕۆم، لەدوای جەنگێکی قورس سوپای ڕۆم شکا و هەرێمەکەی چۆڵکرد، (کەیقوباد) خۆی و سوپاکەی ڕوویکردە شارۆچکەی (کۆهان=کۆیە) لەوێوە ڕوویکردە شارۆچکەی (مارشیما=ئاڵتون کۆپری) و تاکو هەرێمی (ئارابخا=کەرکوك) ڕۆیشت، (مەنوچەهر) کوڕی (سوهراب شا) پاشای دەوڵەتی فارس کە لەجێگەی باوکی بووبوو بەشا کە بەسەرکەوتنەکانی (کەیقوباد)ی زانی بەسوپایەکی زۆرەوە ڕوویکردە هەرێمی (خاوەرزەمین)، (کەیقوباد) کە زانی سوپای فارس هێرش دێنێتە سەر وڵاتی (خاوەرزەمین) خۆی و سوپاکەی گەڕایەوە و لەدەشتی (خاوەرزەمین) سوپای کورد و سوپای فارس کەوتنە شەڕەوە و لەئەنجامدا سوپای کورد شکا و کەیقوباد خۆیی و پاشماوەی سوپاکەی ڕوویانکردە وڵاتی (تورکیە) و لەوێ گیرسانەوە.

ئەم سەرکردەیە سێ ساڵ فەرمانڕەوایی ئەم ناوچانەی کردووە و لەدوای ئەوە (کەیقوبادی ئاراراتی) کە خۆی بەمیدی دادەنا لەهەرێمی (ئارارات)ەوە بەسوپایەکی زۆر تێکەڵاو لە (کورد و ئازەر و فارس) ڕوویکردە هەرێمی (ڕماوێژ) و داوای لە (ڕانك) کرد کە هەرێمەکە بداتە دەستی، بەڵام سەرکردە (ڕانك) لاری بوو ڕازی نەبوو، کەیقوباد بەنەرمی وتووێژی لەگەڵ کرد و ویستی فریوی بدات، ئەوەبوو بۆ نانخواردن بانگیکردن و لەکاتی نانخواردندا هەموویانی دانە بەر تیرئەنداز و خۆی و هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کوژران و بەم جۆرە ئەمارەتە مەزنەکەی سەرکردە (ڕانك) کۆتایی پێهات.

لەناو سوپای فارسدا ئەفسەرێك هەبوو بەناوی (کواکسار) بەڕەگەز میدی بوو، بەنهێنی چەند ئەفسەر و سەربازی کوردی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، لەوکاتەدا دەوڵەتی فارس خەریکی جەنگ بوو لەگەڵ (یۆنان) و دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو وڵاتدا نەمابوو بەتایبەتی (مادستان)، سەرکردە (کواکسار) سوپایەکی کۆکردەوە و ڕوویکردە دەشتی (سندوس و لاجان) زۆربەی ناوچە کوردنشینەکانی دەستبەسەراگرت و خۆی لەدەوڵەتی ئێران پچڕاند و نیمچە دەوڵەتێکی لەکوردستان دامەزراند، ئەنجا سوپایەکی نارد بۆ هەرێمی (باڵەك) و شارۆچکەی (مەساسیری=ڕەواندز)، بەڵام پێش ئەوەی شەڕ دەستپێبکات یەکێ لەئەفسەران کە ناوی (چوبینە) بوو ڕوویکردە کواکسار و وتی: خۆتان دەزانن ئەمیر (فولاد) کە هەرێمی (ڕەواندز

## شوێنەواری گوندەکانی خۆشناوەتی

هەر لەگوندی (بێتواتە) شوێنەوارەکانی دەوڵەتی (خورشیدی مید) و (خوبیار) و (کادی) و سەرکردەکانی تری مید نیە، بەڵکو لەزۆربەی گوندەکانی دەوروبەری (بێتواتە) تا ئێستاش ئەم شوێنەوارانە ماون لەگوندەکانی (هەرتەل، هەرمك، بالیسان، ئەندێك،... هتد).

## شوێنەواری گوندی هەرتەل

گوندی (هەرتەل) کەوتۆتە ڕۆژئاوای (بێتواتە)، ئاوی سارد و باغ و باغاتی زۆرە، (٣٠٠٠) ساڵ بەر لەمێژووی زایینی، پیاوێك بەناوی (هەرتائیلا) پەیدابوو لەگوندی (هەرتەل) کە بەرەگەز میدی بوو، داوای یەزدان پەرستنی لەخەڵکەکە دەکرد، بنچینەی هێزی بیروباوەڕ و بوونەوەری لەسەر ئەمانەی خوارەوە دانابوو:

یەکەم| هێزی چاکە: ئەوانەی بەدوای چاکە دەکەون خۆشەویستی یەزدانن.

دووەم| هێزی خراپە: ئەوانەی بەدوای خراپە دەکەون دژی یەزدانن.

هەندێ لەشەریعەتەکانی ئەم پیاوە بەمجۆرەی خوارەوە بوو:

**١-دەبێ کچ بەئارەزووی خۆی دەستنیشانی هاوسەری ژیانی بکات و تەڵاق بەدەستی ژن بێ.**

## شوێنەواری گوندی نێوە

گوندی (نێوە) لەخۆرئاوای (بێتواتە) هەڵکەوتووە، لەتەنیشت گوندەکە گردێك هەیە بەناوی گردی (میرچاڵان)، لەدەوروبەری ئەم گردە بەدەیان دیواری کۆن و بناغە و کونی دەستکرد هەیە، زۆر شتی کۆنی لێدۆزراوەتەوە وەکو (گۆزە و شمشێر و خشڵی ژنان و پارەی کۆن). لەساڵی (١٩٥٠)ی زایینی (عەلی مامەحەم) خەڵکی گوندی نێوە لەسەر گردەکە بەردێکی چوارگۆشەی دۆزیەوە، ڕەنگی بەردەکە سووری کاڵ بوو، وێنەی گەنجێکی سەر ڕووتی لەسەر کرابوو، لەلای قاچی گەنجەکە وێنەی مارێکی لەسەر بوو، من خۆم بەردەکەم بردە لای شوێنەوارناسێك لەهەولێر، وتی ئەم گەنجە سەرکردەی ئەم هەرێمە بووە، مارەکەش نیشانەی هێزە، بەردەکەم هێنایەوە و دامەوە دەستی خاوەنەکەی، پیاوێك کە ماڵی لەشاری ڕەواندز بوو بەناوی (عەلی ئۆغلو) بەڕەگەز تورك بوو، بەردەکەی لەخاوەنەکەی کڕیبوو بەدەفتەرێك سیغارەی بافرە.

(عەلی محەمەد) خەڵکی هەمان گوند هەندێ پارەی لەگردەکە دۆزیەوە کە هەردوو ڕووی ئایەتی قورئان بوو، من خۆم پارەکەم دیت کە سککەی (عەبدولمەلیك کوڕی مەروان)ی پاشای ئەمەوی بوو. لەڕۆژگاری دەوڵەتی (ئەمەوی) لەگوندی (نێوە) سەرکردەیەکی کورد بەناوی (گۆران) ئەمارەتێکی بنیاتنا و سوپایەکی باشی دروستکرد، سنووری ئەمارەتەکەی لەخواروو تا دەوروبەری (تازەخورماتوو) دەچوو، لەژووروو تاکو (گەلاڵە)ی

## شوێنەواری گوندی بالیسان

(٣٠٠٠) ساڵ بەر لەمێژووی زایینی لەشارۆچکەی (بالیسان) دەوڵەتێك هەبووە زۆر بەهێز بووە، پاشای ئەم دەوڵەتە ناوی (دێگە) بووە، ئێستاش گردێك هەیە لەخوارووی (بالیسان) بەناوی گردی (دێگە) کاتی خۆی ئەم شایە قەلأیەکی لەسەر ئەم گردە دروستکردووە، ئێستاش بناغەکانی ماوە. لەدوای (دێگەشا) کوڕەکەی خۆی کە ناوی (شاجوان) بووە بووەتە پاشای ئەم دەوڵەتە، بەلأم سوپای (ئەفراسیاب) ئەم دەوڵەتەی ڕووخاندووە، وشەی (بالیسان) بەزمانی عیبری بەمانای (فێنك و قەدپاڵ) هەر ئەوەندە لەبارەی ئەم دەوڵەتە زانراوە.

## شوێنەواری گوندی ئەندێك

ئەم گوندە لەقەدپاڵی شاخی ماکۆك هەڵکەوتووە، بەدەیان بناغەی کۆشك و خانووبەرە و دیواری لێیە، زۆر شتی کۆنی لێدۆزراوەتەوە وەکو (شمشێر و سەرەتیر و مۆر و پێداویستی کشتوکاڵکردن)، سەرکردەیەك لەم گوندە هەڵکەوتووە بەناوی (مەزن)، ئەمارەتێکی فراوانی دامەزراندوە و تاکو دەشتی هەولێر و لاجان و دەشتی بەرازگر و شارەزووری لەژێردەستدا بووە، ئەم ئەمارەتە بەهۆی سوپای (ئەسکەندەری یۆنانی) لەناوچووە، ئێستاش شوێنێك هەیە بەناوی (مل مەزن).

دانابوو، شمشێری بەدەستەوە بوو پێئەچوو چاوەڕێی فەرمانێکی کچە سوارەکە بکا، وەکو زانیم ئەم بەردە بەقاچاغ گەیشتە دەوڵەتی ئیسرائیل.

لەساڵی (١٩٧٨)ی زایینی کاربەدەستانی (ئەنوەربەگ) لەهەمان جێگا بەردێکی شێوە بازنەیان دۆزیەوە دەوروبەری بەردەکە بەنوسینی بزماری نوسرابوو، ئەم بەردەش درا بە(عزت ئیبراهیم) جێگری (سەدام) لەبەغداد. لەساڵی (١٩٢٨)ی زایینی (خاڵە خێلە) خەڵکی گوندی بێتواتە لەخوار قەڵای (خورشید) پەیکەرێکی لەبەرد دروستکراوی دۆزیەوە کە هەندێ نووسینی لەسەربوو، پێئەچوو پەیکەری ڕاستەقینەی زەردەشت بێ. (شێخ ئەحمەد تەها) لەقەڵای خورشید پەیکەرێکی دۆزیەوە کە پەیکەری (گۆلکێك=گوێرەکە) بوو دوو کەسی ڕووت سواری پشتی گۆلکەکە بووبوون یەکێکیان پیاو و ئەوەی تریان ژن بوو، پیاوەکە کتێبێکی لەبنهەنگڵدا بوو.

لەساڵی (١٩١٦)ی زایینی بەرامبەر قەڵای خورشید (مام عەبدوڵڵای تەڵەوان) لەبن بەردێك جێگەی تەڵە خۆشدەکات، بەردێك دەدۆزێتەوە لەشێوەی هێلکە، هەردوو سەری کونکرابوون نوسینێکی زۆر وردی لەسەر نوسرابوو بەخەتی بزماری پیاوێك بەناوی (میرزا شەلە) کە خەڵکی سلێمانی بوو بەیەك ڕوپیە بەردەکەی لێکڕیبوو. هەروەها لەناو گوندی بێتواتە و دەوروبەری بەسەدان گۆزە و کوپەی گەورە و شتی تر دۆزراونەتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەم سامانە بەنرخەی گەلەکەمان لەبەر نەزانین و بێباکی و بەرژەوەندی تایبەتی هەمووی دزراوە یان ونکراوە یان شکێندراون.

نەمرود پاشا کوڕی کوش کوڕی حام زۆر بەدەسەڵات بوو، یەکەم پاشا بوو تاجی زێڕی لەسەرناوە، شمشێر و کەوان و گورزی زێڕی هەبووە و لەڕەگەزی ماد بوو، هەموو وڵاتی میدی لەدەستدابوو، هەشتا زانای ئەستێرەناس و چل جادووگەری هەبووە لەسەر لوتکەی شاخێکی بەرز ئاوێنەیەکی لەسەر شێوەی لاکێشە داناوە، چوار ڕووی هەبووە، هەرکەسێك یا هەر سوپایەك هاتبایە ناو وڵاتی نەمرود ئەم ئاوێنەیە پیشانی دەدا و پاسەوانی سنوور بەپەلە دەکەوتنەخۆ بۆ لێکۆڵینەوە و خۆئامادەکردن.

لەڕۆژێکی جەژن هەموو ئەستێرەناسان بۆ پیرۆزبایی هاتن بۆ سەرا و پەردەی نەمرود و نزای تەمەن درێژیان بەسەردا خوێند، دوای دانیشتن گەورەی ئەستێرەناسان کە ناوی (هاداش) بوو هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی شای شایان گۆڕانی ئەستێرەکان وا پیشاندەدات کە لەناو گەلی میدی منداڵێك دەبێ، لەدواڕۆژدا لەدژی بەڕێزتان ئەجوڵێتەوە و ئایینی باپیرانمان تێکدەدا و داوای ئاینێکی نوێ دەکات. نەمرود زۆر دڵتەنگ بوو، وتی: ئەم منداڵە چۆن بدۆزینەوە؟ یەکێك لەئەستێرەناسان کە ناوی (کارۆئاخا) بوو هەستایە سەرپێ و وتی: ئێمە ئامادەین هەموو هەوڵێکمان بخەینەگەڕ لەپێناو دۆزینەوەی ئەم منداڵە و پاراستنی ئایینی خۆمان و بەڕێزتان، ئەنجا شایاری جەنگ (ئاراوسون) هەستا و وتی: بۆئەوەی ئەو منداڵە لەناوبرێت کە بەدژی تاجی مەزنتان هەڵدەستێت، پێویستە ئەوە قەدەغە بکرێت کە هیچ پیاوێك نابێت بچێتە لای ژنەکەی و فەرمان بدەی هەر ژنێك دوگیان بێ چاودێری

دەمژێ، بەمجۆرە منداڵەکە لەناو ئەشکەوتەکەدا مایەوە جارجار دایکی بەنهێنی دەچوو بۆلای لەگەڵ ئازەری باوکی یاخود بەتەنیا.

ئازەر لەگەڵ ئەوەی ڕاوێژکاری نەمرود بوو، بتتراشێکی کارامەش بوو، لەئەشکەوتی (بتکار) بتی دروست دەکرد و بەپارە دەیفرۆشت، ئەشکەوتی (بتکار) لەودیوی شاخی (ماکۆك) لەسەروی گوندی (نۆرێ) لەدۆڵی (شاورێ) هەڵکەوتووە. دەربارەی ناوی دایکی (ئیبراهیم) لەتەوراتدا دەڵێ: ناوی (نونا) بوو، کتێبی ستارەی تابانی مەحمودی حەمامیان دەڵێت ناوی (کەوباڕ) بوو، ئاغا بەهاری لەکوردنامەدا دەڵێت ناوی (ڕێواس) بوو. دەربارەی باوکی (ئیبراهیم) مێژوونوسان دەڵێن ناوی (تأریخ) بوو، بەلاّم لەقورئاندا ناوی بابی ئیبراهیم بەناوی (ئازەر) دەبات و دەفەرموێت (وإذ قال ابراهیم لأبیه أزر)، بەلاّم مەحمودی حەمامیان لەکتێبی (أبگینەی تأریخ)دا دەڵێت: ئازەر باوکی ئیبراهیم بوو، بەلاّم ناوی ڕاستەقینەی (تأریخ) بووە، بەڵگەی بۆ ئەمە دەڵێ: ڕۆژێك باوکی ئیبراهیم لەسەر ڕەوەزێك بەربووە و قاچی شکا، قاچیان بۆ هەڵبەستەوە و دوای چاکبوونەوەی دەشەلی لەبەرئەوە پێیان دەوت (ئازەر) بەزمانی ماد (ئازەر) واتە (شەل). هەندێ لەمێژوونوسانیش پێیانوایە (ئازەر) ناوی ئەو بتەیە کە خۆی پەرستویەتی هەندێکیش دەڵێن (ئازەر) بەمنداڵی دەردەدار بووە، کاتێك خەڵك لەدایکیان دەپرسی کوڕەکەت چۆنە؟ دەیوت ئازاری هەیە لەبەرئەوە ناونرا (ئازەر).

منه، ئەمە گەورەترە، کاتێ ئەویش ونبوو، وتی: ئا ئەمەش خوا نییە، کاتێ ڕۆژ هەڵات بەهەمان شێوە، ئەنجا وتی: ئەمانە هیچیان خوا نین، ئەمانە هەمووی دروستکراوی خوان. گەلی (نەمرود) جەژنێکیان هەبوو هەموو ساڵێك لەشەوی جەژندا پیر و لاو و منداڵ دەچوونە مەزرا لەشوێنێك کۆدەبوونەوە و ئاگریان دەکردەوە و لەدەوری ئاگرەکە هەڵپەڕکێیان دەکرد، خواردنی (کەشکەك)یان دروست دەکرد و دەیانبردە ناو بتخانەکە و بۆ پیرۆزبوون دایاندەنا، کە دەگەڕانەوە دەچوونە بتخانەکە و خواردنەکەیان دەخوارد.

ئەم شەوە هەموو خەڵکی شارەکە هاتنە دەرەوە و (ئیبراهیم)یشیان لەگەڵدا بوو، کاتێ گەیشتنە نزیکی بتخانەکە و مەزرای دەرەوەی شار، (ئیبراهیم) وتی: من نەخۆشم توانام نییە بەشداری جەژنەکەتان بکەم و گەڕایەوە ناوشار، چوو بیورێکی دەستدایە و خۆیکرد بەناو بتخانەکە و هەموو بتەکانی شکاند و لەگەڵ قاپ و مەنجەڵی کەشکەك تێکەڵاوی کردن، بیورەکەی لەسەر ملی بتە گەورەکە دانا و ڕۆیشت، بتە گەورەکە ناوی (بروسك) بوو، وا هەڵکەوت ئەوکاتەی (ئیبراهیم) بتەکانی دەشکاند، کاهینە (بیبی) لەکونجی بتخانە لەسەر جێگا خەوتبوو لەبەر نەخۆشی نەیتوانیبوو هاوبەشی خەڵکەکە بکات، لەبەرئەوەی کاهینە (بیبی) نوێنی بەسەر خۆیدا دابوو، (ئیبراهیم) نەیدیبوو، ئەنجا لەدوای شکاندنی بتەکان (ئیبراهیم) ڕوویکردە شاخی (ماهیکۆك=ماکۆك).

دەستنیشانکرد لەپشتی گوندی (سەرچاوە)ی ئێستا لەژێر چیای ماکۆك لە(دۆڵ ناران).

لەڕۆژی دیاریکراو خەڵکەکە هەموویان کۆبوونەوە، بۆ سوتاندنی (ئیبراهیم) مەنجەنیقێکی گەورەیان کردەوە و ویستیان (ئیبراهیم) بخەنە ناو ئاگرەکە، بۆ ئەمە (هەینی) کە کورد و خەڵکی (لاجان) بوو، (بەردەقانی)یەکیان دروستکرد و (ئیبراهیم)یان خستە ناو (بەردەقانیەکە) و خستیانە ناو ئاگرکە، ئەنجا خوای گەورە فەرمووی (ئەی ئاگر سارد و سەلامەتبە لەسەر ئیبراهیم)، لەتەورات لەسفری ئەنبیا دەڵێت: کاتێ (ئیبراهیم) خرایە ناو ئاگر بەفەرمانی خوا ئاگرەکە ساردبووەوە و لەناو ئاگرەکە ئاو پەیدابوو، گوڵ و گیا شینبوو، ئەنجا ڕۆژ لەئاو و ئاگرەکەیدا و پەلکەزێڕینە لەشاخی بەرامبەری پەیدابوو، خەڵکەکە وتیان (زەردەشت) واتە (بریسکەی ڕۆژ) چونکە وشەی (زەردەشت) بەواتای (بریسکەی ڕۆژە).

خۆم جێگای ئاگرەکەم دیوە گۆڕەپانێکە لەقەدپاڵی شاخی ماکۆك لەسەرووی گوندی (سەروچاوە)، ڕووبەرەکەی نزیکەی (٣٨٠) مەترچوارگۆشە دەبێ لەکاتی بەهاریشدا گیای لێناڕوێت، دەڵێن لەو ڕۆژەوەی ئاگری نەمرودی لێکراوەتەوە تاکو ئێستا هیچ جۆرە گیایەکی لێنەڕواوە، لەسەرووی گۆڕەپانی ئاگرەکە کەپکە شاخێك هەیە بەناوی (تەپکی مام هەینی)، لەبەرئەوەی (مام هەینی) لەوێوە (ئیبراهیم)ی خستۆتە ناو ئاگرەکە، لەکتێبی (خازن)ی تەفسیری قورئان دەفەرموێت: ئەوەی ئیبراهیمی فڕێدایە ناو ئاگرەکە ناوی (هەینی) بوو کوردی ئێران بوو.

## شوێنی لەدایکبوون و دانیشتنی ئیبراهیم

بەگوێرەی ئەم شوێنەوار و پاشماوانەی کە لەدەوروبەری (بیتوێن و بێتواتە)دا هەن وا دەردەکەوێ کە (ئیبراهیم) لەگوندی (کۆسی خەلان) لەژووررووی دۆڵی شاورێ لەدایکبووە، وشەی (کوس) لەزمانی میدی بەواتای (گوند) هاتووە، (خەلان) بۆتە (خەلیل)، بەو مانایە (کوسی خەلان) واتە (گوندی خەلیل)، ئەو ئەشکەوتەی کە (نونا) ئیبراهیمی تیایا شاردەوە لەسەررووی گوندی (میرەبەگ)ە، ئێستاش بەم ئەشکەوتە دەڵێن ئەشکەوتی (مام برایم) و خەڵك زۆر دەچێت بۆ زیارەتی.

مامۆستا مەلا ئەبوبەکری بۆسکێنی دەیگوت ئەم ئەشکەوتە جێگای شاردنەوەی (ئیبراهیم) بووە لەترسی نەمرود بۆ زیاتر سەلماندنی ئەوەی کە (ئیبراهیم) لەم ناوچەیە لەدایکبووە و ژیاوە و باوکی زستانان هاتۆتە (بیتوێن) و هاوینان چۆتە گوندی (بێتواتە) و دەوروبەری مەرداری کردووە، ئەمانەی خوارەوە دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** لەخوارووی گوندی بێتواتە بناغەی قەلایەك هەیە پێی‌دەڵێن (قەلای باخەلان)، لەکۆنەوە بەتەمەنەکان دەڵێن ئەم قەلایە هی بابی (ئیبراهیم) بووە، واتە قەلای (ئازەر)ی بابی (ئیبراهیم) بووە.

**دووەم:** هەر لەخوارووی گوندی بێتواتە گۆڕستانێکی زۆر کۆن هەیە بەناوی گۆڕستانی (خەلکە)، خەڵکی ناوچەکە دەڵێن

نەمرودنامە دەڵێت: ئیبراهیم لەهۆزی (ئاریاس) ژنێکی هێناوە، لەم ژنە سێ کوڕی هەبووە، ناویان (بیتوێن و کۆدۆ و شیر) بووە، بیتوێن لەدەشتی (نارین=بیتوێن)ی ئێستا خەریکی کشتوکاڵ بووە و دەسەڵاتی هەبووە، بۆیە ئێستا بەناوی دەشتی بیتوێن ناودەبرێت. کۆدۆ خەریکی بەخێوکردنی ئاژەڵ بووە هاوینان دەچوو بۆ شاخی (کۆدۆ) لەسەر سنووری ئێران، زستانان دەهاتەوە هەرێمی (کۆدەڵە) لەدۆڵەگۆران، گوندی (کۆدەڵە) بەناوی (کۆدۆ) ناودەبرێت. شیر خەریکی خزمەتکردنی باغات بووە، لەگوندی (شیرەی خواروو) دادەنیشت، ئەم گوندە بەناوی ئەوەوە ناودەبرێت.

لەساڵی (١٩٤٩)ی زایینی بۆ کارێکی تایبەتی چووم بۆ (دیاربەکر) میوانی مامۆستا مەلاعەلی قەرەحەسەن بووم، کە زۆر شارەزا بوو لەمێژوو دەیوت: کتێبی (تأریخ الامم) دەڵێت: لەهەرێمی خۆشناوەتی گوندێك هەیە بەناوی (هیران) ئەم گوندە لەکۆندا ناوی (شوشە) بووە، بەڵام (هاران) برازای ئیبراهیم کە مەڕداری دەکرد زۆربەی وەرزی ساڵ لەم گوندە مەڕەکانی دەلەوەڕاند، بەتایبەتی زستانان هەرلەوێ دەمایەوە تا وای لێهات گوندەکە بەناوی (هاران) ناودەبرا.

وە هەروەها دەیوت کتێبی (نزهة المجالس) دەڵێت: باوك و باپیری ئیبراهیم لەهەرێمی (ورمێ)ەوە هاتونەتە دەشتی (نارین=بیتوێن)، ئیبراهیم زۆر هاتووچۆی (تورکیا)ی کردووە و لەکوردەکانی ئەوێ ژنێکی هێناوە ناوی (قەنتورا) بووە و لەو ژنە

ڕۆژێـك ئیـبراهیم بـیری لـەمردن و زیندووبونـەوە دەکـردەوە، ئەوەبوو وتی ئەی خوای بونەوەر پیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتـەوە، خوای گـەورە فـەرمووی بڕوات نی‌یە کـە من توانـای هـەموو شـتێکم هـەیـە، ئیـبراهیم وتـی: خـوای مـن ئـەوە دەزانم، کـە توانای هـەموو شـتێکت هـەیـە، بـەڵام دەمـەوێت دڵـم ئارام بگرێـت. ئەنجا خـوای مـەزن فـەرمووی: چـوار باڵنـدە بگـرە و سـەریانبڕە و خوێن و گۆشت و ئێسك و تووکیـان تێکەڵاوبکـە و بیانکه بـەچوار بەش، هەر بەشێکی لەسەر لوتکە شاخێك دانیٚ و خۆشت لەدەشت لەناوەڕاستی ئـەم کێوانـە بوەسـتە و بانگیانبکـە، ئـەنجا دەبینـی چۆن زیندوویان دەکەمەوە.

ئیبراهیم (کەوێك و کۆترێك و پەپوسلێمانەیەك و ڕیشۆڵەیەك)ی گـرت و سـەریبڕین و تێکـەڵاویکردن و بەشـێکی لەسـەر شـاخی (کاسـەڕووت=کۆسـرەت) دانـا و بەشـێکی لەسـەر شـاخی (مـاهی کـۆك=مـاکۆك) و بەشـێکی لەسـەر شـاخی (هـەوران=میرسـەید) و بەشێکی لەسەر شـاخی (کاشـان=قەشـان) دانـا خۆشـی لەدەشـتی بێتواتـە لەسـەر بـەردێك وەسـتا و بانگیکردن، سـەیریکرد خوێـن و گۆشت و ئێسکی هەر باڵندەیـەك دەهـات و خـۆی لێکتردەدایـەوە و دەبووەوە باڵندەی جاران.

لەتەورات لەسیفری ئەنبیا دەڵێت: ئەم ڕووداوە لەوڵاتی میدیـا ڕوویـداوە، وە هـەروەها خـوای مـەزن لـەقورئاندا ئـەم ڕووداوەی بـۆ پێغەمبەر (د. خ) باسکردووە. ئەم بەڵگانە دەریدەخات کە ئیبراهیم لەوڵاتی میدی ژیاوە، واتە لەهەرێمی (نارین=بیتوێن) لەدایکبووە،

میدیەکان کە شتێکی ناڕەوایان دەدی دەیانوت: (مەیکە بەبەیتی بلە)، ئێستاش لەناو کوردەواری ئەمە هەر بەکاردێت و بۆتە پەندی پێشینان، هەروەها پەندێکی تر لەناو کوردەواریدا هەیە دەڵێت: (مایەوە پیرخەل و برازا)، ئەوکاتەی ئیبراهیم ڕۆیشت لەنارین، نەمرود لەپیرۆتەڕەشی وەزیری پرسی کێ لەگەڵ ئیبراهیمدا ڕۆیشت، وتی (پیرخەل و برازا) واتە ئیبراهیم و لوت کوڕی هارانی برازای. ئەنجا ئیبراهیم و هاوەڵەکانی چوونە وڵاتی (کەنعان) واتە (زەوی سوور)، بەڵام لوت و ژنەکەی چوونە شاری (سەددوم) لەئەردەن، ئیبراهیم دوو هەفتە لە(مەکشیم=نابلس) مایەوە، ئەنجا ڕوویکردە وڵاتی (عین شمس=میسر)، کە ئەوکاتە وڵاتی میسر لەژێر حوکمی (هەکسۆسەکان)دا بوو، وشەی (هەکسۆس) وشەیەکی (قیبطی)یە بەواتای (جوتیار)، لەبەرئەوەی ئەوانەی لەمیسردا حوکمیان دەکرد دەشتەکی بوون، بەڵام بەهۆی زۆری ژمارەیان پاشایەتی وڵاتیان وەرگرت.

پاشای (هەکسۆس) کە زانی ئیبراهیم و خێزانەکەی هاتوونە وڵاتەکەی لەدوای نارد و ئەم پرسیارانەی لێکرد: ناوت چییە؟ لەکوێوە هاتووی؟ بۆ کوێ ئەچی؟ بۆچی دەچی؟ ئەو ژنەی لەگەڵتایە چی تۆیە؟ لەچ نەتەوەیەکی؟ ئیبراهیم وتی: ناوم (ئەبراهامە) لەوڵاتی میدیا لەهەرێمی نارین هاتووم، دەچم بۆ دۆڵی (ڤاران=مەککە) و یەکەم ماڵی خواپەرستی دروست دەکەم، خۆم ڕەگەزم میدیە و لەبەرەبابی (سیماشکی) لوڕستانم، ئەو ژنەی لەگەڵمە خوشکمە.

گەورە لەسارا کوڕێکت پێدەبەخشێ زۆر ڕێزدار و فەرمانڕەوا دەبێ، سارا کە ئەمەی بیست بەسەرسوڕماوی وتی پیرەژنی وەکو من چۆن منداڵی دەبێ و دەستیکرد بەپێکەنین، فریشتەکان وتیان خوا هەموو شتێکی پێدەکرێ. ڕۆژێک ئیبراهیم لەغەیبەوە گوێی لەدەنگێك بوو وتی: ئەی ئیبراهیم تۆم لەوڵاتی میدیا دەرکرد، بەڵام نەتەوەکەت ئەوەندە زۆر دەکەم زەوی داگیربکەن و لەچەرخی چواردەدا نەتەوەکەت دەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی کۆمەڵ کۆمەڵ لەسنووری ڕووباری نیلەوە تاکو ڕووباری فورات دەبێتە موڵکی نەتەوەکەت، فینیقی و فاندی و فەدمونی و حیسی و ڕەفانی و ئاموری و کەنعانی کورتی و حەرجاشی و لیبۆسی هەمووی نەتەوەی تۆن و زەوی باپیرانت وەردەگریتەوە. ئیبراهیم بەمە زۆر دڵخۆش بوو و (هاجرە)ی بردە مەملەکەتی (سامی) واتە حیجاز لەوێ ئیسماعیل لەهاجرە بوو، وە لەکاتی دیاریکراودا (ئیسحاق) لەدایکبوو، (تەورات سیفری ئەنبیا).

نەمرودنامە دەڵێت: دوو کەسی زۆر لێهاتوو کە میدی بوون بەنهێنی بڕوایان بەئیبراهیم کردبوو، ناویان (سیکاتان و دیان) بوو، کاتێك ئیبراهیم هەرێمی (نارین)ی بەجێهێشت ئەوان لەوێ مانەوە و بەنهێنی خواپەرستیان دەکرد لەدوای لەناوچوونی نەمرود بەدەردی مەلاریا، ئەو دوو کەسانە دەستیانکرد بەبانگهێشتنی خەڵك بۆ سەر ئایینی ئیبراهیم، وە لەبن شاخی ماکۆك دوو جۆگەیان دروستکرد، هەریەکە و بەجیا بۆ بەراوکردنی دەشتی بیتوێن، ئێستاش جۆگەیەکیان بەناوی (جۆگەی سکتان) و ئەویتریان بەناوی (جۆگەی دیانان) ناودەبرێت.

چوارەم: ئیبراهیم بەسەلامەتی لەئاگری نەمرود ڕزگاری بووە، کاوە ئاگرکردنەوەی کردۆتە نیشانەی سەرکەوتنی بەسەر ئەژدیهاکدا و هەردووکیان ئەستێرەپەرست بوون.

پێنجەم: خێزانی ئیبراهیم ناوی (سارا) بووە، خێزانی کاوە ناوی (پەریسا) بووە. بەڵام من پێموایە ئەمانە بەڵگەی لاوازن و خوێنەر ناتوانێ قەناعەتیان پێبکا، چونکە پێدەچێ ئەمەش بچێتە خانەی شێواندنی مێژووی کاوەی ئاسنگەر و گەلەکەمان.

## پاشماوەی شوێنەواری نەمرود لەدەوروبەری دەشتی بیتوێن و بێتواتەدا

نەمرودنامە دەڵێت: وشەی نەمرود وشەیەکی ڕەسەنی میدیە بەواتای (دەست ئاسنین) یان (خوناو)، بەڵام هەندێ زمانەوان دەڵێن وشەی (نەمرود) بەواتای (ڕووباری گەورە) هاتووە وەکو وشەی (بابل) بەواتای (ڕووبار)، خەڵکی میسر بەرلەوەی بەڕووباری میسر بڵێن (نیل) پێیاندەوت (بابلیو) واتە (ڕووباری گەورە)، بەڵام لەکاتی پاشایانی (هەکسۆس) ناویاننا‌وە (نیل) واتە (شەپۆلدار و بەهێز)، ئێستاش لەزمانی کوردی دەوترێت لەناو (نێڵە)ی ڕووبار، پێدەچێ وشەی نیل کوردی بێ.

نەمرود ناوی داشان کوڕی کوش کوڕی ئاشوران کوڕی حام کوڕی نوح، لەناوچەی بیتوێن لەدایکبووە، لەدوای باوکی بۆتە پاشای وڵاتی میدی، سنووری دەوڵەتەکەی لای سەروو تاکو

چۆتە سەر کانیاوەکەی باسمانکرد و خێوەتی لەسەر بەردەکە هەڵداوە.

مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا هەرتەلی لەکتێبی (مبحث عن منطقة بیتواتە)دا دەڵێت: نەمرود برایەکی هەبوو ناوی (گڕی هەتاو) بوو، لەخوارووی قەڵای نەمرود گردێکی دەستکردی کردبوو کە بەخشتی سوورەوکراوە هەڵنرابوو ناوەکەشی پڕکراوەتەوە لەخۆڵ لەسەر هەرخشتێك وێنەی مانگی یەکشەوەی لەسەر کراوە، ئێستاش ئەم گردە ماوە و زۆرجار ئەمجۆرە خشتانە دەدۆزنەوە کە هەمووی وێنەی مانگی یەکشەوەی لەسەر هەڵکەنراوە، خەڵکی ناوچەکە بەهەرێمەکە دەڵێن: (جرتاوە=گڕتاوە=گڕی هەتاوە) بەناوی برای نەمرود، وە بەگردەکە دەڵێن (گردی تلیٚ).

مێژووی ئەرمەن لەباسی زەردەشتدا دەڵێت: زەردەشتی یەکەم (نوح) پێغەمبەر بووە کە ناوی (زیوس) بووە، زەردەشتی دووەم (ئیبراهیم کوڕی ئازەر) بووە کە لەولاَتی مید ژیاوە لەسەردەمی (نەمرود) واتە (داشان) شای ولاَتی میدی، بەلاَم ئیبراهیم چۆتە ولاَتی (سامی) و لەویٚ یەکەم پەرستگای خواپەرستی دروست کردووە. ئاغا بەهاری موکریانی لەکوردنامەدا دەڵێت: وشەی (زەردەشت) نازناوی ئەو پێغەمبەرانە بووە کە لەلایەن (خوا)وە ناردراونەتە ناو گەلی ماد، یەکێك لەوانە (ئیبراهیم کوڕی ئازەر) بووە لەڕۆژگاری (داشان) شای میدی نێردراوە بۆ ناو گەلی ماد لەهەرێمی (نارین=بیتوێن).

لەسەر فەرمانی خوای گەورە دەستیکرد بەدروستکردنی (ماڵی خوا)، ئیسماعیل لەهۆزی (جورهەمی=عەرەبی قەحطانی) ژنیهێنا لەژنەکەیەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، هەر لەم کاتانەدا ئیبراهیم لەخەودا خوای مەزن فەرمانی پێکرد کە (ئیسماعیل) سەربڕێ و بیکاتە قوربانی، هەردووکیان گەردنیان کەچکرد بۆ فەرمانی خوا، ئیبراهیم ئیسماعیلی بردە کێوی (مینا) بۆ سەربڕین، بەڵام خوای گەورە بەرانێکی ناردە بەردەستی ئیبراهیم و سەریبڕی. تەورات سیفری ئەنبیا دەڵێت: ئیسحاق بوو کرایە قوربانی نەك ئیسماعیل، بەمجۆرە ئیبراهیم لەتەمەنی (٢٨٠) ساڵیدا لەشاری خەلیل لەفەلەستین کۆچی دوایی کرد، ئێستاش گۆڕی پیرۆزی لەوێیە و مەزاری زۆربەی خەڵکی سەرزەوییە.

پایزان لەو ئەشکەوتە خواپەرستی کردووە، کە سەرمای پایز هاتووە ئاگری کردۆتەوە، خەڵك وتویانە (ئاگری ئیداغیٚ)، چونکە ناوی (ئیداغ) بووە و کوڕێکی هەبووە پێغەمبەر بووە، بەڵام تورانی شەهیدیان کردووە. ئەگەر یەکێك تووشی نەخۆشی بوایە دەچوون لەم ئەشکەوتە گڵیان دەهێنا و دەیانکردە ناو ئاو و ئەنجا جەستەی نەخۆشەکەیان پیٚتەڕدەکرد بۆ چاکبوونەوە.

مامۆستا مەلاعەلی قەرەحەسەنی لەکتێبی (کوردلر)دا دەڵێت: گومان لەوەدا نی‌یە کە دایکی زەردەشت ناوی (دغدو) بووە و کچی مام جوامێری موکریانی بووە. مستەر هۆڵد دەڵێت: زەردەشت لەتەمەنی چل ساڵیدا لەناوچەی (خوراسان) دەستیکرد بەبلاوکردنەوەی ئایینەکەی و زۆر سەرکەوتوو بوو، شای ئێران بڕوای بەئایینەکەی کرد، زەردەشت لەخۆشی ئەوە دارێکی سەرووی لەناو باغی شای ئێراندا ڕواند، تاکو ساڵی (٨٦١)ی زایینی ئەم دارە هەرمابوو، بەڵام کاتێك خەلیفەی عەباسی (متوکل علی الله) دەسەلاتی گەیشتە ولاتی ئێران دارەکەی بڕی و هێنایە شاری (سامەڕا) و خستیە ناو کۆشکەکەی خۆی، تەنها لەبەرئەوەی دارێکی پیرۆز بوو لای گەلی کورد و فارس و هەروەها پێشەوایەکی ئایینی کورد ناشتبووی.

هەروەها میستەر هۆڵد دەڵێت: (جاماسیب) کە وەزیری شای ئێران بوو، دەورێکی دیاری هەبوو لەبلاوکردنەوەی ئایینی زەردەشت لەئێران و ئەفغان و ئاسیای دوور. هەروەها دەڵێت: زەردەشت حەوت جێنشینی هەبووە و بلاویکردونەتەوە بۆ

لەساڵی ١٩٤٥ی زایینی من و چەند برادەرێکی تر بۆ کارێکی (کۆمەڵەی ژ. ك) نێردراین بۆ کوێستانەکانی (سپیە ڕێزی خەیلانیان و کانی دەیلاغان و گۆڕی بەربایان و کۆڵانی ماچان و کوێستانی هەزار گوڵ و کەپکی کچەجوان و لێڕی سواران و ساباتی خانمان و کانی خوای). بەر لەنیوەڕۆ گەیشتینە هاوینەهەواری (کانی خوای) لەخوارووی کانیەکە هۆبە ڕەشماڵێك هەڵدرابوو، ڕوومانکردە ڕەشماڵێکی گەورە و جوان، چەند کەسێك لەژێر ڕەشماڵەکە دانیشتبوون دوای بەخێرهاتن و ماستاو و چاخواردنەوە، خاوەنی ڕەشماڵەکە کە ناوی (عەلیان) بوو و لەهۆزی (مامەش) و خەڵکی هەرێمی لاجان بوو، کۆمەڵێ پرسیاری دەربارەی بارودۆخی سیاسی و پرسیاری مەبەستی هاتنمانی لێکردین، دوای قسە و باسێکی زۆر وتم: ئاو دوورە لێرەوە؟ یەکسەر خانەخوێکە وتی ئادەی برایم لەگەڵی بچۆ بۆ سەر ئاوەکە، کاتێ گەیشتینە سەر کانیاوەکە زۆری پێنەچوو سێ کچی جوان هاتنەسەر کانیاوەکە بۆ ئاوبردن، کەمێك لەخوار کانیەکە قەبرێکی کەڵەك لەدەورەکراوی لێبوو، وتم ئەم گۆڕە هی کێیە؟ یەکێك لەکچەکان کە ناوی (کاڵێ) بوو، وتی ئەوە گۆڕی (عەبدوڵڵا عومەرانە) و هاتۆتە ئێرە و شەڕی لەگەڵ کافران کردووە و شەهیدیان کردووە و خەڵك بۆ نیاز و نەخۆشی دێنە سەری و خێری بۆ دەکەن و چاکدەبن، برایم کە گەنجێکی سووروسپی بوو بە(برایمەسوور) بانگیاندەکرد، کردیە سوعبەت و وتی: کاڵێ من بۆ نیاز زۆر هاتومە سەر ئەم گۆڕە، بەڵام بۆم جێبەجێ نەبووە،

بەبلاوکردنەوەی ئایینەکەی، کۆمەڵی (موغانەکان) کە ئاگرپەرست بوون کەوتنە بەربەرەکانیٚ دژی زەردەشت، لەبەرئەوە زەردەشت ڕوویکردە هەرێمی (سیستان) لەوێش سەرکەوتوو نەبوو و ڕوویکردە ولاتی (ئەفغان)، لەویٚ کۆمەڵێك بڕوایان پێکرد و بوونە هاوبەشی، ئەنجا ڕوویکردە شاری (بەڵخ) بۆلای (ویشتاسیب) پاشا کوڕی تەرحان کوڕی کەیئاپۆ کوڕی کەیقوباد، ئەم پاشایە سیوهەشت کوڕی هەبوو، یەکێك لەکوڕەکانی کە زۆر لێهاتوو بوو ناوی (ئەسفەندیار) بوو، (ویشتاسیب) لەنەوەی بەهمەنی باپیرەگەورەی هۆزی لوڕی بەختیاری بوو، خورشیدی خاوەر لەنەوەی ئەو بوو.

زەردەشت داوای لە(ویشتاسب) کرد کە بڕوا بەئایینەکەی بکات، شا بڕوای بەئایینەکەی کرد و کردی بەیاسای دەوڵەت، (جاماسیب) کە وەزیری (ویشتاسیب) بوو، (بەرجیسی) کچی زەردەشتی مارەکرد، وە کچی برای خۆی کە ناوی (ئاهو) بوو دای بەزەردەشت. مەحمودی حەمامیان لەکتێبی (ستارەی تابان)دا دەڵێت: ویشتاسیب یان گۆشتاسیب ڕاستەوخۆ بڕوای بەئایینی زەردەشت نەکرد، بەڵکو داوای لێکرد هەندیٚ لۆکە لەسەر ئاگر دابنیٚ، ئەگەر نەسووتا بڕوای پێبکات، زەردەشت مەرجەکەی قبوڵکرد و لۆکەکە نەسووتا، ئەنجا شا بڕوای پێکرد و ئایینەکەی کرد بەیاسای دەوڵەت.

وەرگـیراوە. شـێخ (إبـن الحجـر) لـەکتێبی (تحفـە)دا لەباسـی مارەکردنی ژنی موسڵمان لە(جولەکە و فەلە و مەجوس)دا دەڵێت: دروستە موسڵمان کچی (مەجوس=زەردەشت) مارەبکات، چونکە ئەوانـە خـاوەن کتێبـی ئاسمـانی بـوون کتێبەکـەیان نـاوی (ئەبستاڤ=ئاڤێستا) بووە.

ئەوکاتـەی (عومـەری کـوڕی خـەتاب) سـوپای ئیسـلامی بەسـەرکردایەتی (سـەعد کـوڕی ئـەبووەقاس) نـاردە کوردسـتان و کوردسـتانی داگـیرکرد، هـەندێ نوسـراوی زەردەشـتیان کەوتـە بەردەست، سەعد نامەی بۆ عومەر نارد و پرسیاری لێکردبوو ئەم نوسـراوانە چـی لێبکـەین، کـاتێك عومـەر نامەکـەی پێگەیشـت، نامەکـەی بۆ هاوەڵـەکانی خوێندەوە، (عەلی کوڕی ئـەبوتالیب) کـە یەکێك بوو لەدانیشتوەکان وتی: من گوێم لەپێغەمبەر (د. خ) بووە فەرموویـەتی (ئەوانـە ئـەهلی کتـابن)، ئـەنجا عومـەر بۆ سـەعدی نوسی: (سنو بهم سنت أهل الکتاب) واتە (وەکو خاوەن کتێبەکان لەگەڵیان بجوڵێنەوە)، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە گومان لەوەدا نی‌یـە کـە زەردەشـت پێغەمبـەرێکی کـوردە و بـۆ سـەر گـەلی مـاد هاتووە.

زۆر لەمێژوونوسـان دەڵێـن: کـورد زۆر پێغەمبـەریان هـەبووە، یەکەم پێغەمبـەریان نـاوی (مەهاباد) بـووە و کتێبی ئاسمـانی بـۆ هاتووە بەناوی (دەساتیری)، یۆنانیەکان دەڵێن: نەتەوەی کورد بەر لـەمێژووی زایینـی دوازدە پێغەمبـەریان بۆ هـاتووە کـە هـەموویان نازناویـان (زەردەشـت) بـووە، زەردەشـتی هـەرەدوایان لـەموکریان

**٦-نابیٚ ئاو پیس بکریٚت.**

**٧-ئەبیٚ ئاگر بەپیرۆز تەماشا بکریٚت.**

نزیکەی سیٚسەد سالٚ ئەم ئاینە لەولاٚتی مادستان پەیرەوکرا و یەزدانیان دەپەرست.

م. ئەحمەد تاجانی لەکتیٚبی (شعله فی درب التأریخ)دا دەلیٚت: بەهەزاران سالٚ بەر لەهاتنی ئایینی مەسیح، لەرۆژهەلاٚتی ئیٚران و لەناو گەلی میدی پیاویٚك سەریهەلٚدا بەناوی (زۆر واسستر) یەکەم کەس بوو وتی: لەبوونەوەردا دوو هیٚزی دژ بەیەکتر هەیە و هەمووکات زۆرانبازی دەکەن ئەویش (هیٚزی چاکە و هیٚزی خراپە)یە و ئەمەی خوارەوەی کرد بەبنچینەی ئایینەکەی:

(یەزدان چاکەخوازە و فریشتەی چاکەی لەدەرووندایە، بەلاٚم ئەهریمەن خراپەخوازە و فریشتەی تاریکی لەدەرووندایە، ئیٚمەش ئەبیٚ یارمەتی یەزدان و فریشتەی چاکە بدەین)، بەلاٚم لەهەریٚمی خۆی کەم کەس بڕوایان پیٚکرد بۆیە دەستیکرد بەگەڕان بەناوچەکاندا بۆ بلاٚوکردنەوەی ئایینەکەی، کۆمەلٚیٚك لەوانە هاتن بۆ دۆلٚی (دیجلە و فورات)، لەجیٚگای بەغدای ئیٚستا گوندیٚکیان دروستکرد و لەئایینەکەی خۆیان لایاندا و دەستیانکرد بەگاپەرستن، ویٚنەی گایەکیان دروستکرد بەناوی (بوغە) لایان وابوو هیٚزی (بوغ) دەچیٚتە جەستەی شای ولاٚت، لەبەرئەوە بەشایان دەوت (درۆبوغ=دەروبوگ=دەرەبەگ)، واتە وشەی (دەرەبەگ) لەوەوە هاتووە. ئیٚستاش کورد بەگای قەلٚەو دەلیٚن (گای بوغە)، وشەی (بەغداد) لەڕەگەزدا (بوغداو) واتە (دانی بوغ) کە خوایان بوو، بەتیٚپەڕبوونی ڕۆژگار (بوغداوا) بۆتە (بەغداد).

## چۆنیەتی سووتـاندنی مردوو لەئایینی زەردەشتدا

کاتێك کەسێك دەمرێت، کاهینی تایبەتی دەیشوات بەمەرجێ ئەم مردووە لەشی خاوێن بێت، بەڵام ئەگەر مردووەکە لەشی پیس و چڵکن بێت ئەوا نایشۆن، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەیسوتێنن، لەکاتی سوتاندندا کاهین ئەم وشانەی خوارەوە دەڵێت: (یەتەها یەتـەها ئـاهوڕاموزدە یەتـەها سروشـا یەتـەها پیروشـالیار و ڤەهیشـتە ڤەهیشـتە، بـەڵام هـەندێ مێژوونـوس دەڵێـن: زۆربـەی زۆری زەردەشتی مردوویان لەگۆڕستان دەنێژن وەکو موسڵمان.

هـەندێکیش دەڵێـن: مردووەکانیـان دەخستە نـاو چـاڵێکی زۆر قوڵ یان لەسەر کێوێکـی بەرز دایاندەنا بۆئـەوەی باڵندە و دڕندە بیخـوات، بەڵام ئەمـەش وازی لێـهێنرا و مردوویـان دەخستە نـاو کوپە و لەسەر لوتکە شاخێکی بەرز دایاندەنا. م. فەتحوڵڵا هەرتەلی لـەکتێبی (مبحـث عـن منطقـة بیتواتـه) دەڵێـت لەسـاڵی (٦٠٦)ی کۆچی لەخواروی گونـدی بێتواتـە بەردێك دۆزراوەتـەوە بەخـەتی (دیـن کـوردە) نوسـراوە، (وەستا خاڵـەی) بێتواتـە ئـەم بـەردەی بردۆتە (شـارەزوور) لای (جاماسـیبی هـەورامی) کـە ئـەم خەتـەی زانیـوە، (جاماسـیب) نوسـینەکەی وەرگێڕاوەتـە سـەر شـێوازی کوردی—سلێمانی، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

((ئەمـەمان لەترسـی قـەومی (ئومـەر=عومـەر کـوڕی خـەتاب) شـاردۆتەوە))، ئـەی ئـاهوڕاموزدەی چاکـەخواز.. هـەمووماں ملکـەچی فـەرمانی تۆیـن.. لەشـەوەزەنگی بـەهارا.. گرشـەی

## پیرەشالیاری زەردەشتی

پیرەشالیاری، سەدوپەنجا ساڵ بەر لەهاتنی ئایینی ئیسلام ژیاوە، یەکێك بووە لەنەوەدونۆ پیرەکانی هەورامان و زۆر لێهاتوو بوو، خۆی باخەوان بوو، بەڵام ئاژەڵداریشی دەکرد، کتێبی (مارفەت) ئەو دایناوە کە هەمووی ئامۆژگاری و پەند و هۆنراوەی بەسوودە، ئایینی زەردەشت ڕێبازێکی تایبەتی هەبوو، دژی بتپەرستی و ئاگرپەرستی و ڕۆژپەرستی بوو، پیرەشالیار برادەرێکی هەبوو ناوی (پیرنەورۆز) بوو، ئەویش یەکێك بوو لەنەوەدونۆ پیری هەورامان و خەریکی کشتوکاڵ بوو، پیرەشالیاریش لەوکاتەدا خەریکی ئاژەڵداری بوو، ماڵی لەودیوی شاخی هەورامان بوو، کاتێك بینی وا (پیرنەورۆز) خەریکی بژارکردنی ناو کێڵگەکەیەتی، دوور بەدوور ماندووبوونی لێدەکات و دەڵێت بۆچی وا خۆت ماندوو دەکەی؟ (پیرنەورۆز) دەڵێت: ئەی پیری گەورەم.. دەمەوێت خۆم کاربکەم بۆئەوەی جەستەم کرمۆڵ نەبێ، (پیرنەورۆز) تەماشادەکات لەتەنیشتی (پیرەشالیار) شمشاڵەکەی کەوتووە، بێئەوەی کەس لێیبدا خۆی دەنگی لێوەدێ و پێی دەڵێ پیری گەورەم خۆت شمشاڵەکە بژەنی باشترە. ئەمەی خوارەوە نمونەیەکە لەبەندی پیرەشالیار، کە لەکتێبی ئاڤێستای وەرگرتووە:

وارێوە وەورە وەرێنە

وەریسە براو چوار سەرینە

باپیرەگەورەی و ئایینی ئیسلام دەکات و ئەوەی لەگەڵ یاسای ئیسلام نەگونجاو بووە لایدەبات.

لەسەر ئامۆژگاری پیرەشالیار کتێبی (ماریفەت) نابێ بدرێتە بێگانە، کاتی خۆی ئینگلیزەکان زۆر هەوڵیانداوە بکەوێتە دەستیان، بەڵام سوودی نەبووە، دەڵێن یەك نوسخە لەم کتێبە لای (عەلی قولی زەنگەنە) هەیە، هەروەها لەمۆزەخانەی تاران هەندێ پەڕەی ماریفەت و ئاڤێستای ڕاستەقینە هەیە. هەندێ لەمێژوونوسان دەڵێن: کورد لەڕەگەزی (سامی کوڕی نوحە)، بەڵام هیچ بەڵگەیەك ڕاستی ئەمە ناسەلمێنێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستیان بەدەستەوە نی‌یە، گومانی تێدا نی‌یە کە کورد لەڕەگەزی (ئارین)، لەبەرئەوەی زۆربەی زۆری هۆز و ناوی کوڕ و کچانی کورد لەزمانی ئارین وەکو (مامەش، مەنگوڕ، کرمانج، زازا، هەمەوەند، کاکەوەند، تەرخانی، لۆلۆ، بابان، کۆماسی، قوبادی، گۆدەرزی، کەلهوڕی، هێزپانی، نوحەری، ئازادبەختی، خورشیدی، گەردی، شکاك) و زۆری تر.

وە هەروەها ناوی کچی کورد وەکو (فەیرۆز، پیرۆز، قەشەنگ، شیرین، خورشیدە، نۆش ئافەرین، ئافتاو، ماهتاب، ناهیدە، گوڵناز، زەماوەند، خوناو،..... هتد). وە هەروەها ناوی کوڕەکان وەکو (فەرهاد، شێرکۆ، ڕۆستەم، شەهریار، ئەردەشێر، ئەردەلان، شێردڵ، دلێر، دلاوەر، نۆشێروان، ... هتد)، بەڵام کاتێ ئایینی ئیسلام لەناو کوردەکان پەرەیسەند و سەقامگیربوو، ئیتر وردە وردە ناو و دابونەریتەکانی گەلی کورد ڕوویان لەکزی کرد و

تەندروستی مرۆڤ سوودی هەیە و تیشکی خۆر هەندێ هۆی نەخۆشی لادەبا.

(دبستان المذاهب) و مێژووی کڵێسای کۆن دەڵێت: ئەوکاتەی (ئەسکەندەری ماکدۆنی) هاتە شارەزووری کوردستان زۆر لەکوردەکان لەترسان وازیان لەئایینی خۆیان هێنا و بەزۆر کران بەبتپەرست و هەندێکیان شارەزووریان بەجێهێشت و وازیان لەئایینی ڕاستەقینەی خۆیان هێنا، بەڵام کاتێك ئەسکەندەر شارەزووری جێهێشت هەموویان گەڕانەوە سەر ئایینی زەردەشت. هەر لەوکاتەدا یەکێك بەناوی (ئاگردۆست) ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد بۆ سەر ئایینی زەردەشت و زۆر شارەزای ئایینی زەردەشت بوو.

هەروەها دەڵێت: ئەوکاتەی (یەزدگورد)ی کورد (سەلمانپاك=مەدائین=تیسفۆن)ی بەجێهێشت لەترسی سوپای ئیسلام لەسەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب) و چووە (کرماشان) سەرکردەیەکی کوردی بەناوی (پاوە) ناردە (شارەزوور) بەمەبەستی ئەوەی کوردەکانی شارەزوور یارمەتی بدەن لەوەرگرتنەوەی (تیسفۆن) پایتەختی دەوڵەتەکەی. کوردی شارەزوور هەموویان زۆر بەدڵسۆزیەوە ئامادەیی خۆیان بۆ دەربڕی، بەڵام (یەزدگوردشا) هەواڵی نارد بۆ (پاوە) کە هەر لەشارەزوور بوو وتی (خاقانی چینی و پاشای خوراسان) هەواڵیان بۆ ناردووم کە یارمەتیم دەدەن بۆیە بەکوردەکانی شارەزوور ڕابگەیەنە و بەناوی منەوە سوپاسیان بکە کە جارێ

داگیرکردووە، هەندێ کورد بوونەتە بتپەرست، هەندێ کورد کە لەهەرێمی (مەسەسیری=ڕەواندوز) بوون بتێکیان پەرستووە کە ناوی (دیانا) بووە و پێیان وتوە (خوای جوانی)، هەروەها چوارسەد ساڵ بەر لەهاتنی حەزرەتی مەسیح، کۆمەڵێك کورد لەهەرێمی (توزخورمان=تۆزخورماتو-تازەخورماتوو) بتێکیان دەپەرست بەناوی (تیر) واتە (خوای جەنگ).

ئاغا بەهاری لەکتێبی (کوردنامە)دا دەڵێت: زەردەشتی موکریانی نوێنەری تایبەتی خۆی ناردە دەوروبەری (ئارەبخا=کەرکوك) کە گەلی (خۆری) لەدەوروبەری ئەوێ بوون، ئەم نوێنەرە (مەزدەسنە) خەڵکێکی زۆری هێنایە سەر ئایینی زەردەشت و چەند پەرستگایەکیان لەهەرێمەکە دروستکرد، ئێستاش شارۆچکەی (تازەخورماتوو) پاشماوەی ئەم گەلە کوردەن، (خۆرماتو) واتە (وڵاتی خۆر). وە هەروەها مەلا بازیدی دیاربەکری لەکتێبی (الشعب الاري)دا دەڵێت: بەسەدان ساڵ بەر لەمێژووی زایین، لەدەوروبەری (ئارەبخا) کۆمەڵێك کورد هەبوون ناویان (خۆری) بوو، میرنشینێکی فراوانیان دروستکرد بەسەرکردایەتی (تازەدیلان)، سنووری ئەم میرنشینە لەخوارووی تاکو ئەودیوی (خومارا=حەمرین) و لەسەرووی تاکو هەرێمی (سۆباریا=بێتواتە) و لەڕۆژئاوا تاکو (گردی حەسۆکە) و لەڕۆژهەڵات تاکو هەرێمی (دینەوەر) بوو. لەناو ئەم گەلە یەکێك سەریهەڵدا بەناوی (سەرمەد)، دەستیکرد بەهاندانی خەڵك بۆ پەرستنی (شیدەر) واتە (خوای گەورە)، وشەی (شیدەر)

یهلکنا الا الدهر)، واته (هیچ شتێك ئێمه لهناونابات ڕۆژگار نهبێت).

م. عهبدولقادر باڵهکی لهکتێبی (تهذیب التأریخ)دا دهڵێت: بهر لههاتنی ئاینی ئیسلام لهگوندی (مارجین=مهرگه) پیاوێك سهریههڵدا دهیوت: تهنها بیرکردنهوه لهههبوون و دهسهلاتی خوا بهسه بۆ ڕزگاری لهڕۆژی دوایی، بهلاّم زۆری نهخایاند و لهناوچوو. م. ئهحمهدی تاجانی لهکتێبی (شعله فی درب التأریخ)دا دهڵێت: زۆربهی مێژوونوسان لهسهرئهوهن که کورد خواپهرست بوون، واته گهلی ماد ههر ئاهوراموزدهی پهرستووه، بهلاّم بهر لهدروستبوونی دهوڵهتی ماد هیچ بهڵگهیهکی ڕوون و ئاشکرا نیىیه ئاخۆ کورد چی پهرستووه.

وشهی (ئاهوراموزده) لهچهند برگهیهك پێکهاتووه (ئاهورا) واته (ڕووناکی)، (موزده) واته (خوان) بهسهریهکهوه واته (ڕووناکیخوان)، وه ههندێك زمانهوان دهڵێن وشهی (ئاهوراموزده) بهواتای (خوای چاکهویست) هاتووه. گهلی کورد ههمووکات ڕووناکیان خۆشویستوه و بهتاریکی دڵتهنگ بوون، وه وشهی (شید یان شێدان) بهواتای (ڕووناکی) هاتووه. ئهو گهلانهی که لهنهوهی (ئارین) و ڕۆژیان پهرستووه، لهبهرئهوه بووه که ڕۆژ سهرچاوهی ڕووناکیه، که ههندێ کوردیش ئاگریان پهرستووه، لهبهرئهوه بووه ئاگر ڕووناکی دهدات، وه گهلی ماد پهیوهندیهکی بههێزی ههبووه لهگهڵ ڕۆژ و مانگ و ئهستێره و با و ئاو و ئههریمهن و سهوزایی)، بهلاّم ئهمانهیان ههموو بهدروستکهری خوا زانیوه لهبهرئهوه لایان پیرۆز بوون.

خەڵك بكەنە ئاگرپەرست، بەم هۆیەوە زۆر كەس بوون بەئاگرپەرست و لەزۆر ڕاستی ئایینی زەردەشت لایاندا و لەزۆربەی شارەكانی ئێران و مادستان ئاگرگە و ئاتەشگەی دروستكرد و خەڵكی هاندا ئەم ئاگرە بپەرستن، پەرستگاكانی ئایینی زەردەشتی هەمووی وێرانكرد و بڵاویكردەوە كە دوو خوا هەیە، یەكەم (هورمز=خوای چاكەخوان) دووەم (ئەهریمەن=خوای خراپەخوان)، وە لەدۆڵی (دیجلە و فورات) جێنشینێكی خۆی دانا بەناوی (موخ كۆهین) كە بەڕەگەز جولەكە بوو، بەڵام خۆی كردبوو بەیەكێك لەبڕوادارانی ئایینی گۆڕاوی زەردەشت.

لەلایەكی تر كاهینە فریودراوەكان دەستیانكرد بەگۆڕینی كتێبی (ئاڤێستا) بەگوێرەی بەرژەوەندی و ئارەزووی خۆیان و ناویان لەئایینە نوێیەكە نا ئایینی (موزدەك). هەر لەوكاتەدا كوردێكی چالاك هەڵسا بەدژایەتی كردنی ئایینی موزدەك هەندێ خەڵكی لەدەوری خۆی كۆكردەوە و چوو بۆ شاری (ئەردەهان=كرماشان) بۆلای (خوسرەوشا)ی میدی كە هەر لەسەر ئایینی نەگۆڕاوی زەردەشت بوو و داوای لە(خەسرەوشا)ی میدی كرد بۆئەوەی لەگەڵ (موزدەك) بجەنگێ، ئەوەبوو (خەسرەوشا) سوپایەكی زۆری نارده دەشتی (لێتوانیان) لەسەر گۆمی (چەلیان) لەخوارووی شاری (سەردەشت)ی ئێران، لەوێ سوپای (موزدەك) و سوپای (خەسرەوشا) كەوتنە جەنگ و سوپای (موزدەك) شكا و (موزدەك) هەڵات و چوو بۆ هیندستان، ئەنجا ئایینی زەردەشت گەشەیكرد و ژیایەوە، تاكو (بابەكی خوڕەمی) هات و لەدژی

# ئاڤێستا

کتێبــی ئاڤێســتا کــە کتێبێکــی ئاسمانیــە و بــۆ پێغەمبــەر (زەردەشتی موکریانی) هاتووە بەزمانی (لوڕی) یان (هەورامی)، لەلایەن خوداوە بەهۆی (سروش=جبریل)ەوە بۆ سەرگەلی میدی نێردراوە، جگە لەئاڤێستا ئەم ناوانەشی پێوتراوە (وست، ئەستا، وستا، ئەوست، ئەوستا، ئەفیستا، ستاق، ئەستاق، ستاغ، ستاە، ئەستاە، ئەیستاە، ستا). هەموو کتابێکی ئاسمانی کە بۆ پێغەمبەرێك هاتووە، کۆمەڵێك ئامۆژگاری و گێڕانەوەی ڕووداو و پێشبینیکردنی ڕووداوەکانی ڕابردوو و چەند یاسا و ڕێسایەکی گونجاوی تێدایە، کە بۆ زەمان و سەردەمی خۆی و تەنانەت دوای خۆشی سوود و قازانجی کۆمەڵ و مرۆڤایەتی هەبووە و هەیە، ئاڤێستاش یەکێکە لەو کتێبانە.

م. مەلا قادری باڵەکی لەکتێبی (تهذیب التأریخ)دا دەڵێت: کتێبی ئاڤێستا حەوت بەشە بەم شێوەیە:

بەشی یەکەم: سوپاسی ئاهوڕامەزدەیە.

بەشی دووەم: گوێڕایەڵی ئاهوڕامەزدەیە.

بەشی سێیەم: ئاشکراکردنی بەدکرداری ئەهریمەنە.

بەشی چوارەم: نزا و پاڕانەوەیە لەئاهوڕامەزدە.

بەشی پێنجەم: بەشی پەروەردەکردنی مناڵ و پیشەسازی و یاسای کۆمەڵایەتیە.

بەشی شەشەم: سروودی یەزدانیە.

ا ب ت ث ج ح ع... تا کۆتایی پیتەکان. ئەو بەشەی باسی پەرستنی ئاهوڕاموزدە دەکات بەبەشی (وەخشورە) ناودەبرێت.

فەیلەسوفێکی ئەمریکی لەکتێبی (قصة الحضارة)دا دەڵێت: ئاڤێستا کتێبێکی زۆر گەورە بوو، بەلأم (ئەسکەندەری ماکدۆنی) زۆری سوتاند و کەمێکی لێمایەوە، (گوشتاسیب شا) دوو نوسخەی نووسیبووەوە، یەکێکیان (ئەسکەندەر) لەشاری (بەسیولسی) سوتاندی، ئەوەی تریان (یۆنانیەکان) بردیان و وەریانگێڕایە سەر زمانی خۆیان. هەر ئەم فەیلەسوفە دەڵێت: ئەم زانستەی یۆنانیەکان فێریبوون هەموویان لەکتێبی ئاڤێستا وەرگرتووە، وە دەڵێت: ئاڤێستا پێنج بەشە:

بەشی یەکەم: (یەزەتا) ئەویش (٤٥) بەشە و هەربەشێک شتێکی بنەڕەتی پەرستنی ئاهوڕاموزدە دەردەخات.

بەشی دووەم: (ویسپیرە) ئەویش (٢٤) بەشە.

بەشی سێیەم: (وندیداد) ئەویش (٢٢) بەشە، هەمووی باسی کۆمەڵایەتی و دژایەتی ئەهریمەنە.

بەشی چوارەم: (یەشت) کە (٢١) بەشە هەمووی سروودی یەزدانیە بەشێوازی پاڕانەوە و یادی ئاهوڕاموزدە.

بەشی پێنجەم: (خود ئاستاق) ئەویش پاڕانەوە و سەڵاوات و نزای تایبەتیە.

مەسعودی دەڵێت: زەردەشت خەتێکی داناوە و ئاڤێستا بەم خەتە نوسراوەتەوە، ئەم خەتە (١٢٠) پیت بووە و زەردەشت خۆی

بەزمانێك كە زەردەشت خۆی دەیزانی، بەڵام زەردەشتیەكان بۆیان هەبوو لەدوای خوێندن لەبەریبكەن، پیتەكانی (٦١) پیتە و بەخەتی (دین دەبیرە) نوسراوەتەوە، زەردەشت كتێبی (زەند) شەرحی ئاڤێستای بەم خەتە نووسیوە، ئەنجا كرایە شێوەی فارسی و ناویان لێنا (یاردە) یان (ڕەتەكوژە).

(عبیدالله الحیدری) لەكتێبی (دین الاكراد)دا دەڵێت: كاتێك زەردەشت بینی زۆربەی زۆری خەڵكی سەر زەوی (بت و ئاگر و ئەستێرە و ڕۆژ و مانگ) پەرستن هاواریكرد و وتی: (ئەی خەڵكینە ئەو شتانەی ئێوە دەیپەرستن هەمووی دروستكراوی ئاهوراموزدەیە، ئاهوراموزدە هۆشی داوەتە مرۆڤ بۆئەوەی كاری چاكبكات و لەشتی ناڕەوا بەدووربێت، ئەو دار و بەردەی ئێوە دەیپەرستن قازانج و زیانی خۆیان نییە، چۆن زیان و قازانجی خەڵكی دەبێ. بیربكەنەوە ئەم زەوی و ئاسمانە ڕازاوە، ئاو و خاك و با و ئاگر و ڕووناكی و تاریكی هەمووی دروستكراوی ئاهوراموزدەیە بۆ سوودی مرۆڤ دروستیكردوون. كتێبی ئاڤێستای بۆ من ناردووە، كە هەمووی یاسای بەجێ و فەلسەفە و ڕۆشنبیری و حیكمەتە.

(مەسعودی)ی مێژوونوس دەڵێت: فارسەكان پێش هاتنی ئایینی زەردەشت ئاگرپەرست بوون، زۆر ڕەوشتی ناشیرین لەناویاندا بڵاوبووبوەوە، بەڵام كاتێ ئایینی زەردەشت سەریهەڵدا، زەردەشت دەستیكرد بەبڵاوكردنەوەی پەند و ئامۆژگاریەكانی ناو كتێبی ئاڤێستا و وتی: ئەوەی شایانی پەرستنە ئاهوراموزدەی

بڵاوکردنەوەی تاوان و بەدکرداری و خراپە لەسەر زەوی، بەڵام بەهاتنی زەردەشت ئەهریمەن کرداری خراپی نەما و ڕووی لەکزی کرد. کتێبی ئاڤێستا دەڵێ ئەهریمەن شەش یاریدەدەری هەیە بۆ تاوان بڵاوکردنەوە، یەکەم یاریدەدەری درۆ و دەلەسەیە، دووەم یاریدەدەری ڕق و تووڕەییە، سێیەم یاریدەدەری دزی و ماڵ خواردنی خەڵکە بەناحەق، چوارەم یاریدەدەری شیرینکردنی تاوانە لەلای تاوانباران، پێنجەم دێوەکان کە بنکەی هەموو تاوانن، شەشەم جادوگەران.

هەروەها دەڵێت: دێوودرنج زۆری دژی دادپەروەریتی‌یە، بڕوایان بەیاسای خاوێنی ئاهوڕامۆزدە نیە، ئەوانە لەناوبرێن باشە، چونکە بۆ مردن باشن، ئەوانە بۆ دۆزەخ بڕۆن باشە، لەبەرئەوە هەموو زەردەشتێك ئەبێ هەموو ڕۆژێ لەکاتی ڕۆژهەڵاتندا ئەم نزایە بخوێنێ: (خوایە ئەی ئاهوڕامۆزدەی چاکەویست، بمانپارێزی لەئەهریمەن و سوپای ئەهریمەن کە تاوانبار و تاوانخوازن، بەسەر چاکەدا زاڵمانبکەی ئەی هورمزی ڕووناکی). زەردەشت بەزۆری بەم نزایە لەبەر ئاهوڕامۆزدە پاڕاوەتەوە:

(ئەی ئاهوڕامۆزدەی چاکەویست نزام وایە کە وابکەی هەموو سەرداران و کاربەدەستانی دەوڵەتی میدی ڕێگەی ڕووناك بگرن، لەڕێی چەوت و لەئەهریمەن بیانپارێزی هەموو کەسێك و ڕۆڵەیەك بەئازادی لەدایکی دەبێ، دەستی ئەو زۆردارە باڵانەکەی کەس

لەمێژوونوسان پێیانوایە (ئەفلاتون) کاکڵەی وتارەکانی زەردەشتی بۆ شینەکراوەتەوە بەتەواوی، هەر لەبەرئەوە کەوتۆتە دودڵیەوە دەربارەی زەردەشت و جادوگەری، سەرەڕای ئەمەش ئەفلاتون بڕوای پتەوی بەئایینی زەردەشت هەبووە کە ئایینێکی ئاسمانیە و یاسای ئاهوڕامۆزدەیە. زۆر لەمێژوونوسان دەڵێن: پایەی زەردەشت لەهەموو لایەنێکی زانست و لاهوت زۆر بەرزتر بوو لەپایەی (ئەفلاتون)، چونکە زەردەشت پێغەمبەر بوو و ئاڤێستای لەلایەن خواوە بۆ هاتۆتە خوارێ کە خەڵك هاندەدات بۆ بیر و وتار و کرداری باش و دژی ئەهریمەنە.

مامۆستا مەسعود محەمەد کۆیی جەلیزادە دەڵێت: کتێبی ئاڤێستا (١١٠٠) ساڵ بەر لەزایین سەرچاوەی هەموو هەستی ڕوحی زانستی لاهوتی و فەلسەفەی ژیان بوو، سەرچاوەی هەموو کار و کردارێکی باشی جیهان بوو، وە پەیڕەوانی ئایینی زەردەشت هەمووکات خواپەرست بوون و لەناو گەلانی جیهان بەخواپەرست ناسراون. سەرسام دەڵێت: ئەگەر بەوردی بیر لەو چیرۆکانەی کە شەوانی زستان لەدەوری ئاگردان ئەگێڕدرانەوە و باسی دێو و جنۆکە و عێفریتی زۆر تێدایە ئەمانە پەیوەندی زۆری بەئایینی زەردەشتەوە هەیە. پێموایە (سەرسام) بەتەواوی لەئایینی زەردەشت نەگەیشتووە، بۆیە ئەمانە پاڵدەداتە ئایینی زەردەشت.

١٣–دووربە لەم سێ شتانە (خانەی بەجەنگ، پیێڵاوی تەنگ، ژنی قەڵبەزەنگ).

١٤–بەپلە و دەوڵەمەندی لەخۆت بایی‌مەبە، لەوانەیە ڕۆژێ هەژاربی و دابەزی.

١٥–لەگەڵ هاووڵاتت بژی.

١٦–درۆمەکە و بەڵێنی درۆ بەمناڵە بچوکەکانت مەدە.

١٧–تووشی هەرکەسێک بووی چاک و خۆشی لەگەڵ بکە.

١٨–ئەوە بزانە تیژترین چەک زمانی ژنی چەنەهەراشە.

١٩–دەستی پاک و دڵی پاک و زمانی پاک فریشتەی سەرزەویبە.

مامۆستا (عبیداللە الحیدری) لەکتێبی (الاکراد و الوثنیة)دا دەڵێت: ئاڤێستای زەردەشت داوای ئەم شتانە دەکات و زەردەشت ئەوانەی بەپایەی سەرەکی ئایینەکەی زانیوە:

یەکەم: (هۆخت) واتە لەهەموو وتار و کردارتدا ڕاستگۆبە.

دووەم: (هۆمت) دەروون پاکی و بیرکردنەوەی پاك.

سێیەم: (هۆرشت) واتە کرداری چاك و یارمەتیدانی کردارچاکان و دژایەتی ئەهریمەن.

هی خۆیان و هەر یاسا و سروودێکی ئایینی سەریهەڵدەدا، تا هاتنی ئایینی ئیسلام هەمووی سەرچاوەکەی کتێبی ئاڤێستا بوو.

واتە فارسەکان خۆیان کردە خاوەنی هەموو فەلسەفە و ئەخلاق و فەرهەنگ و زانست و سروود و ئیلهاماتی ئاڤێستا، لەبەرئەوەی لەوکاتەدا دەوڵەتی (ماد=کورد) ڕووخابوو کورد بێدەوڵەت بوون و ئاڤێستا لەلایەن فارسەکانەوە بەکتێبێکی بێگانە سەیردەکرا و گۆڕیان بۆ سەر زمانی خۆیان، چونکە زەردەشت کورد بوو و ئاڤێستای بەکوردی بۆ هاتبوو، ئاشکراشە هەر پێغەمبەرێك بۆ ناو هەر کۆمەڵ و گەلێك بێت ئەبێ بەزمانی ئەو گەلە قسەبکات و یاسا و ئامۆژگاری و پەیامەکانی خۆی بەزمانی گەلەکەی خۆی بلاّوبکاتەوە. خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (وما أرسلنا من رسول إلا بلسان قومه) واتە ئێمە هیچ پێغەمبەرێك نانێرین ئەگەر بەزمانی قەومەکەی نەبێ. ئەمەش زۆر ئاشکرایە ئاڤێستا و زەردەشت بۆلای کۆمەڵی میدی هاتبوون.

لەمێژووی (٥٥٠) ساڵ بەر لەمێژووی زایین، فارسەکان بەسەرۆکایەتی (کۆرش) دەوڵەتی (ماد)یان ڕووخاند، لەساڵی (٥٥٢)ی پ. ز یۆنانیەکان هەموو زانست و هونەر و ڕۆشنبیری کوردیان سوتاند. بەهۆی ئەمانەوە کورد بێبەش بوو لەزانست و ڕۆشنبیری و فەلسەفە و زانیاری کتێبی ئاڤێستا، لەو ڕۆژەوە کورد بێبەش بوو بەرامبەر زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری خۆی، بگرە بەرامبەر بەخاك و ولاّتی خۆی. لەم بارەیەوە (بلوتارك) کە بەر لەمێژووی زایینی ژیاوە دەڵێت: (٣٥٦) ساڵ بەر لەمێژووی

سوتاندنی پەرستگای (ئەسینا) ئەمەم کرد کە فارسەکان سوتاندیان.

هەندێ لەمێژوونوسان وەکو مەحمودی حەمامیان، ئەحمەدی تاجانی، شەریفی حەیدەری دەڵێن: لەشاخی پشتی هەمەدان پەیکەری زەردەشت دروستکرابوو، کە کتێبی ئاڤێستا و مۆمێکی بەدەستەوە بوو، وە هەروەها هەر لەپشتی هەمەدان کۆشکێکی لێبوو، ئەم کۆشکە حەوت دیواری هەبوو، هەر دیوارێك ڕەنگێکی هەبوو، ئەم کۆشکە پڕبوو لەزێڕ و زیو و بەردی بەنرخ و چەندان بەردی بەنووسین هەڵکەندراو و سەدان پەیکەری دەستکردی لێبوو، ئەسکەندەر پەیکەری گەورەی زەردەشت و هەموو کۆشکەکانی سوتاند و وێرانکرد، ئەوەی کە بەنرخ و گرنگ بوو بەلایەوە هەمووی ناردەوە (ئەسینا)، بەمجۆرە گەلی میدی کەوتە ژێردەستی و برسیەتی و پەرێشانی، وە هەروەها خورافات و ئەفسانە و شتی خراپ لەناو گەلی میدی بڵاوبووەوە و کتێبی ئاڤێستا کەوتە بەر هێرشی دەستکاری و گۆڕین و کەمکردن و زیادکردن و بڵاوبونەوەی جادوگەری و بتپەرستی و دژایەتی کردنی یەکتری.

بەمجۆرە ئاڤێستا نوسرایەوە و کرایە یاسای دەوڵەتی فارس و هەرچی ئایین و زانست و دابونەریتی جوان بوو زەوتیانکرد و ناوی کوردیان لەسەر کتێبی ئاڤێستا سڕیەوە و ناویاننا (پەیامی پیرۆز) یان (ڕەهبەری میهەنی فارس) وە هەرچی وشە و ڕستەی کە باسی کوردی تێدابوو گۆڕیان و کردیانە هی فارس و مێژووی پڕشکۆی کورد و زانستی فراوانی ئاڤێستای کوردی کرایە هی فارس و داگیرکرا و گەلانی ئێران لەدەوری ئەم یاسا تازەیە کۆبوونەوە بەناوی گەلی فارس، لەهەمان کاتدا دەوڵەتی (ڕۆما)ش دەستیکرد بەگەشەپێکردنی ئایینی مەسیح و ڕێزلێنانی قەشە و مەتران و کاردینال و هەر جەنگێکی لەنێوان ئەم دوو ئیمپراتۆریەتەدا ڕوویدەدا ناویاندەنا جەنگی ئایینی.

لەمێژووی کۆمەلانی ڕۆژهەلاتدا دەڵێن: ئەگەر پاشایەك سەردانی پاشایەکی بکردایە لەپاشاکانی ساسانی بۆ پێشوازی ئەم پاشایەی سەردانی کردووە کتێبی ئاڤێستایان دەبرد بۆ پێشوازی، بەلام (ئەردەشێر) ئەم یاسا و ڕێسایەی گۆڕی و لەجیاتی ئاڤێستا یەکێکی دەنگ گەورەی دەنارده سەر منارەیەك کە بۆ ئەم مەبەستە دروستکرابوو لەنزیك شوێنی پێشوازی، لەکاتی گەیشتنی پاشای هاتوو بۆ سەردان، ئەم دەنگ گەورەیە لەسەر منارەکە بەدەنگی بەرز بیست ویەك جار دەیوت: (های، های، های،....) تاکو (٢١) جار بەقەدەر ژمارەی سوورەتەکانی ئاڤێستا. کاتێ کە تۆپ دروستکرا بۆ پێشوازی پاشایان (٢١) تۆپیان دەتەقاند تاکو ساڵی (١٩٣٥) تا (١٩٤٠)ی زایینی ئەم نەریتە لەهەندێ شوێن هەرمابوو.

ئەگەر کەسێك ویستی قسەت لەگەڵ بکات بڵێ من پێویستم کردووە لەسەر خۆم بۆ خوا چەند ڕۆژێك قسە نەکەم.

دایکی منداڵەکە هەڵدەگرێت و دەیهێنێتەوە ناو هۆزەکەی، کە چاویان بەم ڕووداوە دەکەوێ هەموو خەڵك ژن و پیاو لەدەوریان کۆدەبنەوە و دەستدەکەن بەنەفرەتکردنی و تانەلێدانی، ئەنجا دایکی ئاماژە بۆ منداڵەکە دەکات بۆئەوەی قسەیان بۆ بکات، منداڵەکە کە لەسەر بێژنگێك دادەنرێت ڕاست دەبێتەوە و دەڵێ: ئەی قەوم دایکی من دەست و دڵ و دامەن پاکە، دوورە لەهەموو تاوان، من بەندەی خودام و پێغەمبەرێکی پیرۆز و مەزن و ئاشتیخوازم، خوا کتێبی ئینجیلم بۆ دەنێری، کاتێ منداڵەکە ئەمە دەڵێ خەڵکەکە باوەڕی پێدەکەن بەتایبەتی کاهینەکان. ئەمە دەقی ئاڤێستا بوو کە لەگەڵ قورئان یەکدەگرنەوە و جیاوازیەکی وایان نی یە.

ئاغا بەهاری موکریانی لەکتێبی (کوردنامە)دا دەڵێت: لەڕۆژگاری (شا هێرودیس) لەوڵاتی (کەنعان) لەشاری (بیت لحم) کە حەزرەتی مەسیح لەدایکبوو، شەو ئەستێرەیەکی گەش لەئاسمان پەیدابوو، زەردەشتیەکانی هەرێمی (ئۆرارتۆ=ورمێ)، چەند کەسێکی شارەزایان هەڵبژارد بۆئەوەی لەهۆی هەڵهاتنی ئەم ئەستێرەیە بکۆڵنەوە، زەردەشتیەکان هاتن بۆلای (شاهێرودیس) ئەویش زۆر ڕێزی لێگرتن و داوای لێیانکرد کە کات و شوێنی لەدایکبوونی ئەم پێغەمبەرەیان پێبڵێن تاکو ئەویش ڕێزی لێبگرێت و بڕوای پێبکات، بەڵام زەردەشتیەکان زانیان ئەو

## ئاڤێستا و مژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام محەمەد (د. خ)

مامۆستا (عبدالحمید جودە) و مامۆستا (عەباس مەحمود ئەلعەقاد) دەڵێن: کتێبی ئاڤێستای زەردەشت بەڕوونی مژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی داوە و ئاڤێستا لەم بارەیەوە دەڵێت: لەدوای هەموو پێغەمبەران پێغەمبەری خاوەن وشترە سوورە دێتە مەیدانی خواپەرستی لەشاری (ڤاران=مەککە) لەدایك دەبێ و بۆ شاری (یثرب=مدینە) کۆچ دەکات لەدەستی ناحەزان، لەوێ ئایینی نوێ کە بۆ هەموو کۆمەڵ دەگونجێ بڵاودەکاتەوە، پێغەمبەرێکی گشتی ئیسلامە و دۆستی خوێندەوارییە و دڵی جیاجیا دەگەیەنێتە یەکتری، بتپەرستی ناهێڵێ و مافی ژن دەپارێزێ، بالاًی نە کورتە و نە درێژە و زۆر بەوێڵە و ڕێزدارە و دۆستی هەژارانە، دژی زۆردارانە ئایینی ئەو هەموو ئایینی سەرزەوی پوچەڵ دەکاتەوە.

## نەورۆز

وشەی نەورۆز واتە (ڕۆژی نوێ) وە مێژوونوسان زۆر مانای تریان بۆ داناوە، لەکۆنەوە هەموو ساڵێك و لەسەرەتای وەرزی بەهار لەڕۆژی ٢١ی ئازار کورد لەم ڕۆژەدا ئاهەنگ دەگێڕن و یادی دەکەنەوە و لەسەر لوتکەی شاخەکان ئاگردەکەنەوە. پێش هەموو شتێ ئەبێ ئەوە بزانرێ ئاخۆ (نەورۆز) ڕووداوێکی ئەفسانەیە یاخود ڕووداوێکە و بەڕاستی ڕوویداوە؟ وە ئایا کاوەی ئاسنگەر نەورۆزی داهێناوە یاخود نەورۆز لەکاوە کۆنترە؟

ئەحمەدی خانی، نەورۆز بەجەژنێکی سروشتی گشتی کورد دادەنێت. مەحمودی حەمامیان، بەجەژنێکی نەتەوەیی کوردی دادەنێت. ئەحمەدی تاجانی، بەجەژنێکی سیاسی کوردی دادەنێت. مەسعودی و تەبەری و مەقریزی دەڵێن: ئەخمینیەکانی فارس ڕۆژی نەورۆزیان بەسەری ساڵ داناوە و ئاهەنگیان بۆ گێڕاوە. زۆر لەمێژوونوسان دەڵێن: نەورۆز زۆر لەڕووداوی کاوە و ئەژدیهاك کۆنترە، بەڵام ڕووداوی کاوە و جەژنی سروشتی گەلی کورد بەیەکەوە بەستراون و (ڕووداوی کاوە لەڕۆژی جەژنی سروشتی کوردا ڕوویداوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (نوح) پێغەمبەر و بەر لەکاوە و ئەژدیهاك و فەرەیدون نەورۆز هەبووە و ئاهەنگی بۆ گێڕدراوە.

هەندێك مێژوونوس نەورۆز بۆ سەدەی شەشەمی پ. ز دەگەڕێننەوە، هەندێکیش لایانوایە (٢٥) سەدە پ. ز نەورۆز

دروستبوونی دەوڵەتی ڕاگەیاند، بەم بۆنەیەوە ئەم ڕۆژە کرایە ڕۆژی نویٚ واتە نەورۆز.

هەندێکیش دەڵێن: ئەو ڕۆژەی ئاگر دۆزرایەوە کرایە جەژنی نەورۆز، وە هەندێك لایانوایە ئەو ڕۆژەی ئادەم و حەوا کەوتنە سەر زەوی بەیەکەم ڕۆژی نویٚ ئەژمێردرێت، واتە لەدەستپێکردنی ئادەمیزاد لەسەر زەوی کە تێیدا ژیانی مرۆڤ دەستپێکرد و ئەم ڕۆژە نوێیە بوو بەمێژووی سەری ساڵی ئەوانەی لەدوای ئادەم هاتن و کاروباری ڕۆژانە و ساڵانەی خۆیان لەسەر ئەم مێژووە جێبەجیٚ دەکرد کە بەزمانی فارسی ئەم دەستەواژەیەی پیٚئەوتریٚ (پس أز هبوط). وە هەندیٚ مێژوونوس دەڵێن: نەورۆز لەو ڕۆژەوە دەستپێکرد کە کەشتی نوح لەدوای تۆفان نیشتەوە و ئەم ڕۆژەیان کردە ڕۆژێکی نویٚ واتە نەورۆز، چونکە دوبارە ئەم کۆمەڵە مرۆڤە ڕووداو و کرداریان بەڕۆژی ئەو دابەزینە دەستپێکرد و کوردستان بوو بەلانکی دووەمی ئادەمیزاد و مرۆڤایەتی.

وە هەروەها دابەزینی کەسێك لەئاسمان و بەهەشتی خوا و دابەزینەوەی دوای تۆفان بۆ سەر زەوی، ئەبیٚ ماوەیەکی پیٚبچێت تا ئەو کەسە جێگە و ژیانێکی گونجاو دەدۆزێتەوە، ئەنجا ئەگەر ئەو وەرزەی کە ئادەم و حەوای تێدا دابەزین ئەگەر زستان و سەرما بووبیٚ ئەوا دەسەڵاتی ئەوەی نی‌یە کە شتێکی پێویستی ژیان ئامادەبکات لەبەر سەرما و نەڕووانی هیچ جۆرە ڕووەك و گژوگیایەك، لەبەرئەوە ئەبیٚ دابەزینی ئادەم و حەوا بۆ سەر زەوی

وشەی (پێشدادی) واتە (دانەری داد پێش هەموو کەس)، ئەم دەوڵەتە هەشت پاشای چالاك و لێهاتووی هەبووە، (٢٤٤٧) ساڵ حوکمیان کردووە. لەکتێبی ئاڤێستا باسی (کەیومەرس) کراوە و زەردەشتیەکان بەباوکی مرۆڤایەتی دادەنێن. ئەفسانەی زۆر دەربارەی ئەم پاشایە دەماودەم گێڕدراوەتەوە، هێرۆدیت دەڵێ: پێشدادیەکان لەنەوەی ئارین، بەڵام فارسەکان ئامۆزای ئاریەکانن. لەدوای مردنی (کەیومەرس)، هۆشەنگی کوڕی بوو بەپاشا و چل ساڵ حوکمڕانی کردووە و زۆر گرنگی بەنەورۆز داوە و ئاهەنگی بۆ گێڕاوە، لەدوای (هۆشەنگ) کوڕی خۆی بوو بەپاشا کە ناوی (شەوەری) بووە و نزیکەی (٣٠) ساڵ حوکمڕانی کردووە و بتپەرستی لەسەردەمی ئەودا بڵاوبوەوە.

لەدوای ئەم شایە چەند پاشایەکی تر هاتوون و حوکمڕانیان کردووە، تاکو هاتنی (جەمشید شا)، ئەم شایە زۆر وریا بووە و خەڵکی لەکۆچەری قەدەغەکرد و شار و دێهاتی تری دروستکرد، شارێکی بنیاتنا بەناوی (پرسبلیبوس) و کردی بەپایتەختی دەوڵەتەکەی و هەر لەو شارەدا تەختێکی سەرسوڕهێنەری دروستکرد و ناوینا (تەختی جەمشید).

لەسەردەمی (جەمشیدشا) گەلێك شتی نوێ و داهێنانی تازەی هێنایە بواری پێداویستیەکانی ژیان و خزمەتی کۆمەڵ وەکو: ڕۆژی نەورۆزی کردە سەری ساڵ و یەکەم تەقویمی هەتاوی دانا، لەبواری پیشەسازیدا و لەسەردەمی ئەودا بۆ یەکەم جار گەچی بەکارهێنا بۆ دروستکردنی خانوبەرە و هەروەها ئاسنی نەرم

داخست، واتە بەهۆی بڵاوکردنەوەی چاکە و خواپەرستی کەس تاوانی نەدەکرد کە هۆی چوونە دۆزەخە.

ئاڤێستاشوناسی دەڵێت: جەمشید ڕۆیشت لەدوای ئەوەی هەموو چاکەویستی جێبەجێکرد بەرەو پردی (جنیود) واتە (پردی ڕۆیی)، بەفەرمانی ئاهوراموزدە لەهەشتی مانگی خاکەلێوەوە دەرگای دۆزەخی داخست، هەموو ئەهریمەن و دێوەکانی بەندکرد، خەڵك لەو ڕۆژەوە تاجی شایانەیان لەسەرنا و کڕنوشی پاشایەتیان بۆ برد و ئەم ڕۆژە بوو بەنەورۆز.

ئاغا بەهاری موکریانی لەکتێبی (کوردنامە)دا دەڵێت: کاتێ جەمشید بینی دەوڵەتەکەی سەقامگیر بوو، چاکەخوازان زۆربوون و ئەهریمەنەکان کەم بوون، لەڕۆژی ٢١ی ئازاردا خەڵکی کۆکردەوە و وتارێکی بۆ دان و وتی: (ئەی ئاهوراموزدەی یەکتا.. سوپاست دەکەین کە تۆ بونەوەرت دروستکردووە، ئەی خەڵکینە گوێبگرن... ئاهوراموزدەی چاکەخواز داوامان لێدەکات کردار و وتارمان باش بێت، بەئاوی پاك خۆتان بشۆن، جلتان بشۆن، دەمتان بشۆن، ئەوەش بزانن من خەڵکم لەژیانی تاڵ ڕزگارکرد و خستمنە سەر ژیانی خۆش و شارستانی، لەبەرئەوە هەموو ساڵێك ئەم ڕۆژەی کۆبونەوەمان بکەن بەڕۆژی نوێ-نەورۆز و ئاهەنگی بۆ بکەن و یادی بکەنەوە.

مامۆستا مەلاعەلی قەرەحەسەنی لەکتێبی (الاکراد)دا دەڵێت: کاتێ جەمشیدی میدی بیری لەکارەساتی تۆفان و ڕزگاربوونی کۆمەڵێك ئادەمیزاد و گیانلەبەر و حەوانەوەی مرۆڤ لەخاکی

لەوکاتەدا کە جەمشید پاخیبوو، سەرکردەیەکی بەنەژاد فارس هەبوو بەناوی (ئەژدیهاك) یان (زوحاك) یان (دەهاك) بوو، زوحاك لەبنەماڵەیەکی فارسی بوو، بەلاّم بۆئەوەی لەناز پەروەردەیی دوورکەوێتەوە و ببێت بەسوارچاکێکی چاك ناردیان بۆ (یەمەن) کە ئەوکاتە سەر بەدەوڵەتی پێشدادی بوو. زوحاك کە گەورە بوو گەڕایەوە شارەکەی خۆی و دوای ماوەیەك (مەدراسی) باوکی خۆی کوشت کە زۆر خواپەرست بوو و یەکێك بوو لەکاربەدەستانی فارسی لەدەوڵەتی پێشدادی، ئەوکاتە کە (جەمشید) لەسەر کاربوو بەتەنیا کورد بەشدار نەبوون لەو دەوڵەتە بەڵکو گەلانی تری وەکو فارس هاوبەش بوون لەم دەوڵەتە و پلەوپایەیان لەم دەوڵەتەدا هەبوو.

زوحاك کە باوکی خۆی کوشت، خۆی هاتە جێگای و زۆر زۆردار بوو، بۆئەوە تێدەکۆشا دەوڵەتی کوردی لەناوبەرێ و دەوڵەتێکی فارسی دروستبکات و خۆی ببێتە پاشا، ئیتر وردە وردە بەنهێنی لەدژی دەوڵەتی (جەمشید) خەڵکی هاندەدا و پڕوپاگەندەی بلاّودەکردەوە کە (جەمشید) دژی ئاینە و دژی ئاهوڕامۆزدەیە، تا وایلێهات خەڵك لەدەوری (زوحاك) کۆبونەوە و سوپایەکی زۆری لێدروستکردن بەناوی (هێزی بڕواداران)، بەمەبەستی ڕوخاندنی دەوڵەتی (جەمشید) بەرەو (ئەسفەهان) کەوتەڕێ و هەر بەرگریەکی دەهاتەڕێ دەیشکاند و تاکو (ئەسفەهان)یشی گرت و (جەمشید) هەلاّت بۆ (ئەفغانستان) لەوێش یارمەتی (جەمشید)یان نەدا و لەدواییدا بەهەرجۆرێك بوو

دەیانەوێت دەوڵەت و دابونەریتی جەمشید بژێننەوە دەکوژران و ئەگەر کوردێك چووبایە کۆشکی (ئەژدیهاك) ئەبوایە کڕنووشی بۆ ببات و بڵێ مردن بۆ جەمشیدی ئەهریمەن. لەئەنجامی ئەوەدا زۆرجاران کوردەکان لەدژی (ئەژدیهاك) ڕادەپەڕین، بەڵام بەهۆی سوپای فارس و کوردە خۆفرۆشەکان کپدەکرانەوە.

## دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشی ئەژدیهاك

ئەژدیهاك هەمیشە خەریکی ڕابواردن بوو، چەند دەستەیەکی لێهاتووی دەنگخۆش و چەند گەنجێکی کوڕ و کچی جوانی بۆ سەما و هەڵپەڕکێ هەڵبژاردبوو، لەخواردنی خۆش و شەربەتی میوە و گۆشتی باڵندە و کام خواردنە خۆش و حەزی لێبوو بۆی ئامادە دەکرا لەلایەن چەند چێشتلێنەرێکی شارەزا و زانا لەو بوارەدا. ئەژدیهاك بەم جۆرە نەخۆشیەوە ژیانی ڕادەبوارد، تاکو ڕۆژێك چێشتلێنەرێك هات بۆلای و پێی‌وت ئەی شای ئێران زەمین، من زۆر شارەزای خواردن دروستکردنم و خواردنی جۆراوجۆری وا دروستدەکەم تا ئێستا کەس نەیتوانیوە دروستیبکات، ئەگەر ئەمر بفەرموی ببمە چێشتلێنەری جەنابتان. ئەژدیهاك قبوڵیکرد و کردیە چێشتلێنەری خۆی و لێپرسراوی هەموو چێشتلێنەرەکان و کەوتە دروستکردنی خواردن و خواردنەوەی سەرسوڕهێنەر و جۆرە شەربەتێکی دروستکرد کە

## مێشکی لاوانی کورد دەرمانی دەردی ئەژدیهاکە

چەندان حەکیم و پزیشك سەردانی ئەژدیهاکیان کرد، بەڵام هیچیان نەیانتوانی چارەسەری نەخۆشی ئەژدیهاك بکەن، تاکو رۆژێك خەڵك دیتی پیاوێکی دەست بەگۆچان تورەکەیەکی لەملە و لەرێگای رۆژهەڵاتی ئەسفەهانەوە بەرەو ناو شار دێت و روویکردە کۆشکی ئەژدیهاك و ئێشکچیەکان لێیان پرسی لەکوێوە هاتووی و بۆ کوێ ئەچی؟ وتی من حەکیمم، بیستم پاشای ئێران تووشی دەردێکی کوشندە بووە، هاتووم بەڵکو دەرمانی دەردی شا بدۆزمەوە و چارەسەری بکەم. هەواڵیان بۆ شا برد، ئەویش داوایکرد بێتە لای، حەکیم چووە ژوورەوە و سڵاوی لەپاشا کرد و دوای کەمێك وتووێژ، حەکیم دەستیکرد بەپشکنینی نەخۆشی پاشا، لەدوای ئەوە حەکیم لەبەرامبەری تەختی پاشا دانیشت و وتی: پاشام دەردی تۆ یەکەم دەردە کە روویداوە، دەرمانی ئەم دەردە خواردنی مێشکی مرۆڤی گەنجە و ئەبێ هەموو رۆژێ لانی کەم مێشکی دوو گەنج بخۆی بۆ رزگاربوونت لەم دەردە. زۆر لەمێژوونوسان دەڵێن حەکیم پێی‌وت مێشکی دوو گەنج ئەبێ بکرێتە دەرمان و لەسەر برینەکانت دابنرێ، هەندێکیش دەڵێن پێی‌وتوە ئەبێ بیخۆی، بەڵام پێدەچێ رەئی یەکەمیان راستربێ، واتە مێشکیان لەسەر برینەکەی دانابێ.

بۆچوونێکی تریش هەیە سەبارەت بەنەخۆشیەکی ئەژدیهاك کە مامۆستا ئەحمەدی تاجانیش لەکتێبی (شعلە فی درب التأریخ)دا

جێبەجێکردنی ئەم پیلانە، بۆیە تکام هەیە فەرمان بفەرمووی (ئەسفەندیاری ساکۆهی) دانیشتوی شارۆچکەی (سیاهکۆ) ئامادەبێت، هەروەها (ئەرمائل و کەرمائل) کە هەردووکیان میدین و زۆر دڵسۆزی تۆن و چەندجار بیستوومەتەوە وتویانە هەموو گەلی میدی بەقوربانی ساتێك ژیانی پاشا دەکەین و فەرمان بفەرمووی ببنە چێشتلێنەری تایبەتی تۆی خاوەنشکۆ.

ئەژدیهاك قسەی کچەکەی بەگوێداچوو لەدوای (ئەسفەندیاری) نارد، کاتێ هات (نۆش ئافەرین) پێی‌وت پێویستە کاتی نیوەشەو لەکات و شوێنێکی دیاریکراو ئامادەبیت و هەرکاتێ من بەدوومدا ناردی زۆر بەنهێنی دێیت بۆ ژووری تایبەتی باوکم، لەکاتی دیاریکراودا (ئەسفەندیار) بەپێی بەرنامەکەی بۆی دانابوو هاتە ژووری تایبەتی پاشا، لەژووری پاشادا (ئەژدیهاك و کچەکەی و بەهرامی توسی وەزیری و ئەسفەندیار) ئامادەبوون و دانیشتن بۆ دارشتنی پیلانێك بۆ لەناوبردنی لاوانی میدی و (ئەرمائل و کەرمائل)یشی کردە چێشتلێنەری تایبەتی خۆی.

کەس نایدرکێنی و زۆر بەوردی کارەکە ئەنجامبدە و هەر بەیانی بەبێ دواکەوتن دەڕۆی بۆ وڵاتی هیندستان.

ئەنجا ڕوویکردە (بەهرامی توسی) و وتی: تۆش زۆر بەوردی و بەنهێنی لەماوەیەکی کەمدا ژمارەی گەنجانی میدی دەکەی لەئەسفەهان و دەوروبەری و ژمارەکەی بۆلای من بهێنەوە، ئاگاداری خۆتبە و نەهێڵی کەس بەم نهێنییە بزانێ تۆش ئەی باوکی مەزنم خۆت وا نیشانبدە تاکو شەش مانگی تر هەر نەخۆشی و ئازارت وردە وردە زۆر دەبێ و کاتێ کە هاتنەوەی (ئەسفەندیار) نزیك کەوتەوە بەتەواوی خۆت نەخۆشبکە.

بەمجۆرە (نوش ئافەرین) پیلانەکەی داڕشت و لەهەمان کاتدا دەستیکرد بەڕێزگرتنی گەلی میدی و بایەخی زۆری پێدەدان، تاکو هاتنەوەی (ئەسفەندیار) ئەنجا دوای هاتنەوەی چۆنیان پیلانەکە داڕشتبوو وایان جێبەجێکرد بەمەبەستی قڕکردنی لاوانی کورد. مامۆستا تاجانی دەڵێ: بەڵگەی ڕوون بۆ دانانی ئەم پیلانە لەدژی گەلی مید و بەتایبەتی لاوەکانیان ئەوەیە لەئەسفەهان و دەوروبەری زۆر نەتەوەی تر ئەژیان وەکو (فارس و ئازەری و ئوردی و تورانی)، بەڵام تەنیا لاوانی کورد سەردەبڕدران و مێشکیان دەکرایە دەرمانی دەردی زوحاك. مامۆستا باڵەکی دەڵێ: لەسەر فەرمانی ئەژدیهاك هەموو ڕۆژێك دوو گەنجی کورد دەگیران و سەردەبڕدران و مێشکیان دەدرایە دەستی (ئەرمائل و کەرمائل) ئەوانیش دەیاندایە بەناو (حەکیمی هیندی) و ئەویش دەیکردە دەرمان و لەسەر برینی سەرشانی زوحاك دایدەنا.

# کاوەی ئاسنگەر

شەریفی خەسرەوی لەکتێبی (ناودارانی گەلی میدی)دا دەڵێت: کاوە خەڵکی (سیستان) بوو، یەکێك بوو لەسەرکردەکانی سوپای ئەسکەندەری ماکدۆنی، بەڵام لەدوای گەڕانەوەی ئەسکەندەر بۆ وڵاتی (یۆنان) کاوە لەوڵاتی میدی مایەوە. بەڵام زۆر لەمێژوونوسان دەڵێن: کاوە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی دەوڵەتی (جەمشید)، کاوە لەئەسفەهان مایەوە لەدوای کوژرانی (جەمشید) دەستیکرد بەپیشەسازی ئاسنگەری.

دەڵێن کاوە هەژدە کوڕی هەبووە، حەڤدەیان سەربڕدراون و مێشکیان کراوەتە دەرمانی دەردی زوحاك و تەنها کوڕێکی ماوە بەناوی (ژەنگار)، کاوە پیاوێکی وردبین و بیرکەرەوە بوو، لەکارەساتدا خۆڕاگر بوو، زۆری تاڵاوی ئازار چەشتبوو بەهۆی لەدەستدانی کوڕەکانی. باوکی کاوە (چوبینە) و دایکی ناوی (پەریسا) بوو، لەگەڵ جەمشیدی میدی یەك پشت بوون، کاوە خواناس و بڕوای بەپێغەمبەر (مهاباد) هەبوو بەدەستووری ئەو خواپەرستی دەکرد، دەستێکی ڕەنگینی هەبوو لەدروستکردنی ڕم و شیر و سەرەتیری ئاسن، هەروەها زرێی ئاسنی دروستدەکرد بۆ لەبەرکردن لەشەڕدا. کاوە وشەیەکی کۆنی میدیە واتە (خۆری ڕووناك)، کاوە زۆر حەزی لەڕاو کردووە ئەسپێکی هەبووە بەناوی (بروسکە).

## فەرەیدون و باخەوانی دۆستی باوکی

فەرەیدون کوڕی ئابتین بوو، دایکی ناوی فرانك بوو، هەندێ مێژوونوس دەڵێن دایکی ناوی (ژاڵە) بوو، فەرەیدون و کاوە لەگەڵ جەمشید یەك پشت بوون، باوکی فەرەیدون سەربڕرابوو بەمەبەستی دەرمانی ئەژدیهاك. ئەژدیهاك کاربەدەست و سیخوڕەکانی ڕاسپارد بگەڕێن بەدوای ئەو منداڵەی کە ناوی فەرەیدونە و بیکوژن، بەهەزاران منداڵ کوژران بەناوی فەرەیدون، دایکی فەرەیدون کە بەمەی زانی بەشەو فەرەیدونی کردە پشتی بردیە لای باخەوانێك کە دۆستی باوکی فەرەیدون بوو و سەربردەکەی بۆ گێڕایەوە و بۆ بەیانی دایکی فەرەیدون مانگایەکی هەبوو ئەویشی برد بۆلای باخەوانەکە و بەشیری مانگاکە فەرەیدونی بەخێوکرد.

بەمجۆرە فەرەیدون ماوەی سێ ساڵ مایەوە، هەر لەوماوەیەدا کاربەدەستانی ئەژدیهاك هەڵیاندەکوتایە سەر ماڵی فرانك بۆ دۆزینەوەی فەرەیدون و سەربڕینی، بەهۆی ئەو ژن و پیاوانەی کە لەکۆشکی زوحاکدا کاریان هەبوو پەیوەندیان بەم گەنجە میدییانەوە هەبوو کە لەئەشکەوتی چیای دەماوەند ژیانیان بەسەردەبرد و ڕزگاریان بووبوو لەدەستی زوحاك و هەموو هەواڵێکی زوحاکیان پێڕادەگەیاندن. هەواڵی ئەوە هات کە جەلادەکانی زوحاك نیازیان وایە بچن بۆلای باخەوانەکە بەمەبەستی دۆزینەوەی فەرەیدون.

کرایە دەرمانی دەردی زوحاك، تۆش لەنەتەوەی میدی و خاك و ولاتمان لەلایەن زوحاکەوە داگیرکراوە. فەرەیدون کە ئەمەی بیست وتی دایەگیان هەر ئێستا دەچم لەناو کۆشکەکەیدا دەیکوژم و تۆڵەی باوکم و ئەو گەنجانەی لێدەکەمەوە.

دایکی وتی: کورم تۆ هیچ پیلانێکت بۆ ئەم کارە دانەناوە و لەگەڵ کەس قسەت نەکردووە بۆ ئەم مەبەستە، ئەی نازانی زوحاکیش سوپا و دەست و پێوەندی گەلێك زۆرە، بۆ ئەو کارەی تۆ دەتەوێ بیکەیت ئەبێت بەرنامەیەکت هەبێ و پەیوەندی بەئەو هەزاران گەنجە میدییانەوە بکەی کە لەدەستی زوحاك ڕزگاریان بووە و ئێستا لەشاخ و ئەشکەوتەکاندا ژیان دەبەنەسەر و چاوەڕوانی هەلێك دەکەن بۆ لەناوبردنی زوحاك. فەرەیدون بەئامۆژگاریەکانی دایکی هوشیار بووەوە، ئەنجا پەیوەندیکرد بەئەو گەنجانەی کە لەشاخ بوون و دوای ماوەیەکی کەم لەیەك هێزدا ڕێکیخستن و ڕۆژانەش گەنجی تر دەهاتنە ناو ئەم هێزە و پەیوەندی لەنێوان شاخ و شاردا دروستکرد.

زوحاك کە بەمەی زانی ئارامی نەما و هەموو کاتێك لەپەژارەدا دەژیا و ڕۆژێك دارودەستەکەی کۆکردەوە و وتی ڕاوێژتان چییە بۆ کپکردنەوەی یاخیبووەکان و ڕای خەڵك. دارودەستەکەی دوای وتوێژێکی زۆر وتیان: وا باشە لەمەودوا نەرمی بەکاربێنی و لەگەڵ خەڵك باش بی و دڵی خەڵك بۆلای خۆت ڕاکێشی و بەرژەوەندی گشتی ڕەچاوبکەی. زوحاك بەڵێنیدا چیتر زۆرداری نەکات و بڕیاریدا لەڕۆژی جەژنی نەورۆز پارە و دیاری

دەربارەی گەنجە میدییەکانی شاخیش وتی: خۆتان ئاگادارن کۆمەڵێك یاخیبوون و دەستیانداوەتە شاخ و بەهاندانی چەند کەسێك دەیانەوێت ئاسایشی وڵات تێکبدەن و کوشتن و وێرانکاری لەوڵاتدا بڵاوبکەنەوە، بۆیە دەبێ ئێوە و هەموو خەڵکی ئێران لەدژی ئەوانە بوەستن و دەسەڵاتی دەوڵەتی کۆرشی گەورە بپارێزن و نەهێڵن سەریان بەرزبکەنەوە و لەناویانببەن و بیانکوژن لەپێناوی پاراستنی گەل و وڵات.

هەر لەو ڕۆژانەدا کاوە و فەرەیدون پەیوەندیان لەنێوان شاخ و شاردا توندتر کرد و شەوانە چەند کەسێك بەنهێنی لەشاخەوە دادەبەزینە ناو شار بۆ وەرگرتنی هەواڵ و دەنگوباسی کۆشکی زوحاك و ناوشار. دەستەواژەی نهێنی لەوکاتەدا لەنێوان خەڵکانی لایەنگری خۆیان ئەمە بوو: (هەتەرێ و مەتەرێ سەری ئاوەڵانم شتێکمان بۆ باوێ دەرێ)، ئەوانەی دادەبەزین بۆ ناو شار و دەچوونە ئەوماڵەی پەیوەندیان پێوە هەیە لەدەلاقەی ماڵەکەوە ئەم دەستەواژەیەیان دەوت و ماڵەکەش هەر هەواڵێکی نوێ هەبوایە پێیان دەوتن و چی پێویست بوایە بۆیان دەکردن و دەگەڕانەوە شاخ، ئەوەی سەرپەرشتی ئەو شتانەی دەکرد کاوە بوو.

لەڕۆژی دیاریکراودا کاوە و فەرەیدون خۆیان و گەنجە ئازادیخوازەکان دەوری کۆشك و تەلاری زوحاکیاندا و خەڵکێکی زۆر لەلایەنگرانیان لەدەوریان کۆبوونەوە و هەستیان دەکرد شتێك ڕوودەدا، ئەو ئێشکچیانەی لەدەوری کۆشکی زوحاك بوون لەم

دۆزەخ، زوحاك فەرمانیدا كە (ژەنگار)ی كوڕی كاوە هەر ئێستا ڕزگاربكەن.

كاوە بەدەنگێكی گەورە وتی: بڕیاری لێبوردنی تاوانبارانت داوە كە دز و پیاوكوژن، بەلاّم بڕیاری لێبوردنی بێتاوانان نادەی كە گەنجی میدین و لەبەندیخانە چاوەڕێی سەربڕینن.. ئێوەش ئەی كاربەدەستان و زانایان و كاهینانی حەوت هەرێمی زوحاكی زۆردار، تاوانێكی گەورە دەكەن پشتگیری ستەم و زۆرداری دەكەن، چونكە ئاڤێستا دەفەرموێت: (پارمەتیدەری زۆرداران دەبێتە سەگی دۆزەخ لەدنیای دووەمدا).

كاوە هاتە دەرێ و ڕوویكردە جەماوەر و وتی: ئەی كۆمەڵی زۆرلێكراوان.. ئەی گەلی قارەمانی میدی، هەمووتان دەزانن زوحاك دۆزەخێكی بۆ هەر حەوت هەرێمی ئێران داخستووە و كوشتن و تالاّن و وێرانكاری بلاّوبۆتەوە، ئێستاش هەلمان دەستكەوتووە، ڕۆژی ڕووخانی كۆشكی زۆرداری زوحاكە، هەمووتان یەكگرن و لەمەیدانی خەباتا یەك دەنگ بن بۆ لەناوبردنی ئەم دوژمنە، ئێمە هەر ئێستا دەمانەوێت بڕۆین بۆلای فەرەیدون، داواتان لێدەكەم ئێوەش لەگەڵمان بن و دوامانكەون.

بەمجۆرە كاوە و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون و زۆربەی هەرەزۆری ئامادەبووان دوایكەوتن و ڕووبەڕووی بارەگای فەرەیدون دەڕۆیشتن و فەرەیدونیش خۆی و هێزەكەی بەرەوڕووی كاوە دەهاتن و لەدەشت هەردوو هێزەكە بەیەكگەیشتن و دەستلەملانی یەكتربوون، كاوە ئالاّی بەدەستەوە بوو لەگەڵ فەرەیدون یەكتریان

(ئەرنەواز و شەهرنەواز) کە زوحاك بەزۆرداری کردبوونیە ژنی خۆی هاتنە لای فەرەیدون و بەخێرهاتنی فەرەیدونیان کرد و دڵخۆشی خۆیان دەربڕی، فەرەیدون زۆر ڕێزی گرتن و بەڵێنی پێدان کە زوحاك بەزووترین کات لەناوبەرێ و دەوڵەتەکەی بڕوخێنێ.

(کەلندرو) کە وەزیری زوحاك بوو و یەکەم خۆشەویستی بوو، ئەمینداری هەموو خەزێنەی دارایی و نهێنییەکانی زوحاك بوو، هاتە لای فەرەیدون و هەموو کلیل و نهێنییەکانی دایە فەرەیدون، بەڵام هەواڵ هات کە زوحاك لەهیندستانەوە سوپایەکی زۆری هێناوە، هەر لەوشەوەدا (کەلندرو) هەڵات و خۆی گەیاندە زوحاك و هەموو هەواڵێکی پیڕاگەیاند، بەڵام زوحاك بڕوای پێنەکرد و وتی: ئەمانە لەکۆشکی من میوانن و تۆ لەترساندا خەڵەفاوی لاتوایە فەرەیدونە. (کەلندرو) وتی میوانی چی گەورەم فەرەیدون لەسەر تەختی تۆ دانیشتووە و هەردوو ژنەکانتی لەملاوئەولای خۆی داناوە و گورزێکی وەکو سەری گاجووتی بەدەستەوەیە، جەماوەر لێی کۆبۆتەوە.

زوحاك کە ئەمەی بیست دەستیکرد بەلێدانی (کەلندرو)، سوپای هیندستانیش کە زانیان کار لەکار ترازاوە گەڕانەوە، زوحاك ڕۆیی و چەند کەسێك لەدارودەستەکەی خۆی ڕوویکردە ناو شار و خەڵك لەمبەر و لەوبەر دایانە بەر بەردودار، بەڵام فەرەیدون لەکۆشك هاتە دەرەوە و فەرمانیدا زوحاك بگرن و بیبەنە

ڕۆژگـــاری دەوڵــەتی پێشــدادی ســەردەمێکی زێڕیـــن بـــوو، فەرەیدون نمونەی شای لێهاتوو بوو، دەیان ساڵ حوکمڕانی کرد، فەرەیدون سێ کوڕی هەبوو (سلم، تور، ئیرەج)، ولاّتی کردە سێ بەشی سەرەکی، بەشی ڕۆژئاوای (سلم)ی کردە حوکمڕان و بەشی ڕۆژهــەلاّتی کەوتــە دەســتی (تـــور) و بەشـــی ناوەڕاســـتی درا بە(ئیرەج)ی برا بچوکیان، بەلاّم (سلم و تور) بـەحوکمڕانی (ئیرەج) ڕازی نـەبوون و لەهـەلێکدا کوشتیان و ســەرەکەیان نــاردەوە بـۆ فەرەیدون.

ئەنجا (منوچهر)ی کوڕی (ئیرەج) لەتۆڵەی باوکی (سلم و تور)ی کوشــت و لــەجێگای فــەرەیدون بـــوو بەپاشــا، (ســامی کـــوڕی نــەریمان)ی کــردە وەزیــری خــۆی مشــورخۆری ولاّت، لــەدوای (منوچهر) نەوزەری کوڕی بوو بەپاشا کـە بەدەستی (ئەفراسیاب) کوژرا بەکوشتنی (نەوزەری) کۆتایی بەدەوڵەتی پێشدادی کوردی هات، ئەنجا دەوڵەتی (کەیانی) هاتە ســەر حوکـم و (٧٤٢) ســاڵ حوکمڕانی کـرد، کــە زۆر مێژوونـوس بـەکوردیان دادەنێـن ئـەنجا دەوڵـەتی مـادی دووەم هاتـە سەر حوکم و پـەنجا سـاڵ حوکمڕانـی کرد تاکو هاتنی ئیمپراتۆریەتی ئیسلام.

## سەردەمی ئیسلام و نەورۆز

لەسەردەمی (عومەری کوڕی خەتاب) نەورۆز قەدەغەکرا بەهەموو جۆرێك، بەلاّم لەسەردەمی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) ماوەدرا کە لەڕۆژی نەورۆزدا شیرینی و حەلْوا دابەش بکرێت بەسەر خەلْکدا بەناوی نەورۆز. دوای هاتنە سەر حوکمی دەولْەتی ئەمەوی و لەسەردەمی (معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان)دا لەجەژنی نەورۆز و میهرەگان باج‌وخەراج و دیاری لەجوتیاران و خەلْك وەردەگیرا بۆ بەهێزکردنی سوپای عەرەب، هەروەها ڕێگایدا هەندێ نەریتی سادەی جەژنی نەورۆز جێبەجێ بکرێت.

لەدوای (معاویە) زۆربەی خەلیفەکانی دوای ئەو ئەو باج‌وخەراجەیان لەجەژنی نەورۆز و میهرەگان وەردەگرت لەخەلْك. لەسەردەمی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) جەژنی نەورۆز بەهیچ شێوەیەك ڕێگە نەدەدرا جێبەجێ بکرێت و وتی لەسەردەمی پێغەمبەر و جێنشینەکانی یەکەم و دووەم قەدەغەکراوە لەبەرئەوە ئەبێ قەدەغە بکرێت. لەسەردەمی دەولْەتی عەباسیدا جەژنی نەورۆز گرنگی پێدرا بەتایبەتی لەسەردەمی (مأمون رشید) و لەو سەردەمەدا لەجەژنی نەورۆز خەلْك یادی دەکردەوە و شاعیران و نوسەران ئاهەنگی نەورۆزیان دەگێڕا، هەروەها ڕۆژژمێریان گۆڕی و ڕۆژی نوێبوونەوەی سەری سالْیان کردە ڕۆژی نەورۆز.

هەمزەی ئەسفەهانی دەلْێت: پێش هاتنە سەر حوکمی دەولْەتی عەباسی باجی نەورۆز بەمێژووی کۆچی وەردەگیرا، بەلاّم لەسەردەمی دەولْەتی عەباسیدا کرایە ڕۆژی نەورۆز. لەسەردەمی

# فەرهەنگی ئاڤێستا

## پیتی -أ-

ئاهوراموزدە: خوای گەورە و خێرخواز.

ئەهریمەن: شەیتان.

ئاتەر: ئاگر.

ئاڤ: ئاو.

ئاهەنگ: ئاهەنگ.

ئاخستن: جوتکردن و ڕێکخستن.

ئاتریات: هێشکچی ئاگر.

ئاری: ویستن، خۆزگە.

ئارهی: مار.

ئاژانە: ڕەچەڵەك.

ئافریفتە: مەدحکردن، ڕەزامەندی.

ئافەنت: ئاوەدانی.

ئاکوەرە: لەوەڕگە.

ئازیا: ئاشی دانەوێڵە هاڕین.

ئاکچووریەم: چوارەم.

ئاگاز: ئاگادار.

ئایرا: نەژادی ئاری.

ئایزما: تاقیکردنەوە.

ئەنا: ئەنجا.

ئەزامە: ئازا.

ئەنەگرە: بارەگای خوا، زۆر، ڕووناك.
ئەڤدی: ئەویدی.
ئەفوخڤەرانە: نێوچاوان، ئاوەڕۆ.
ئەکە: زمانشڕ، بەدگۆ.
ئۆرڤەرا: شینبوون، ڕووان.
ئوشترە: حوشتر.
ئەیفا: یەك.
ئەبشام: ئەوان.
ئەس بیانهە: هەمبانە.
ئەیزمە: داری سوتاندن.
ئاپۆ: مام، ڕێبەر.
ئاواز: خوای شمشاڵ و زوڕنا و دووزەلە.
ئازەر: ئەستێرەی گەلاوێژ.
ئەردەلان: شێر.

## پیتی -ب-

بەگە: خوای خوایان.
بەوری: دەرگای خوا، قاپی خوا.
بەردەهی: یاریدەدان.
بەر: بردن.
بەخت: بەش.
بەخت و داڵە: خاوەن بەخت، خاوەن بەش.
بێخور: دەهەزار.

دەفەر: دەروازە.

دەڤە: دوو، ژمارە (٢).

دەرەفشە: ئالاّ.

دوك دەگەر: كیژ، كچ.

دراجە: درێژ.

دوزەهرە: درا.

دوش: دژ.

دوشی مندە: دوژمن.

دوجكە: زوشك، زیشك.

دومە: دەنگ.

## پیتی -ه-

هاڤەن: ئاون.

هاڤیشڤەتە: قوتابی ئایینی زەردەشت.

هێربزان: ناوی كاهینی نهێنیەكانی ئایینی زەردەشت.

هامینە: هاوین.

هەتیاتی: حەفتا، ژمارە (٧٠).

هەرەز: برۆ ئازادبە.

هەنجەنی: پارچە پارچە.

هەیتیێ: كەژ، وەرز.

هەڤەر: ڕۆژ.

هێزو: زمان.

هەزەنرە: هەزار، ژمارە (١٠٠٠).

خشڤەش دەسە: شازدە، ژمارە (١٦).

خشەب: شەو.

خشەڤشتی: شەست، ژمارە (٦٠).

خشماکە: ئێوە.

## پیتی -ت-

تڤەنت: هێز.

تەمە: تەم.

تەشە: تەشتی گەورە.

تەنو: بەدەن، لەش.

تەوڕنە: تەڕ.

تورە: ئازا.

تێخمە: پتەو.

تێکهرە: چوست و چالاک.

تەنەسوورە: کاهینی سوتاندنی مردووی زەردەشتیەکان.

## پیتی -پ-

پادهە: پێ.

پەڕوو: دوو، ژمارە (٢).

پەڕەدەهاتە: دادوەری.

پەرتشی: پشت.

پەزدو: ئەسپێ.

پەزۆ: مەڕ.

کەتە: جێگەی پیرۆزی زەردەشتیان.

کەرە: کردن.

کەرەنە: تەنیشت.

کەرش: ڕاکێشان.

کەرشوەر: وڵات.

کەرەنا: کێرد.

کەفە: بەڵغەم.

کەشە: سەرشان.

کەڕناوس: کەڕ.

کەمەرا: پشتێن.

کەینا: کچ.

کەوفە: گردۆڵکە.

## پیتی -گ-

گاتە: سروودی خوایی.

گاتو: جێگە.

گام: کات.

گام شووشە: جام، سەهۆڵ.

گەرەهە: گەروو.

گەڕێز: گلەییکردن.

گەڤە: گاجووت، گا.

گەیویی: شاخ، کێو.

گەوسپەننە: مێگەلی مەڕ.

مەوەنگ: مانگ.

مینۆ: خۆشی.

مەیشە: کاوڕ.

موشتی: مەست.

میزدە: کرێ.

موبزان: ناوە بۆ ئەو مامۆستایەی ئاڤێستا بەخەڵك دەڵێت.

## پیتی -ن-

نەمەنە: ناو.

نەمرە: ناسك.

نیەرا: نیاز، مەرام.

نەیوبیڤە: ئازایەتی.

نەیزە: نێزە.

نەیمە: نیوە.

نیژاتی: نەژاد.

نیگا: ئاوڕدانەوە، تەماشاکردن.

نوو: ئێستا، هەنووکە.

نۆڤید: موژدە.

## پیتی -س-

سووگینە: سووند، سوێند.

سەتە: سەد، ژمارە (١٠٠).

سەتەمین: سەدەمین.

## پیتی -ف-

فەخشۆبەرە: خواپێداو.

فەرشە: چۆمەڵان.

فەهیە: باش.

فشەرمە: شەرم.

فشۆیەتی: سەپان، شوان.

فرەلە: زۆر، پان.

فەریشتە: بەخت.

فەهیشتە: بەهەشت.

## پیتی -ڤ-

ڤەج: ئاخاوتن.

ڤەدئۆیە: مارەکردنی ژن.

ڤەرگە: گورگ.

ڤەزەگە: بۆق.

ڤەسترە: کراسی درێژ.

ڤەفرە: بەفر.

ڤیچیرە: فەتوای شەرعی.

ڤیمنە: گومان.

ڤیسە: ژەهر.

ڤیسش: ماڵ.

ڤینەد: دیتن، بینین.

ڤیوە: مێرد.

# سەرچاوەکان


**یەکەم/ بەزمانی عەرەبی**

١-قورئانی پیرۆز.
٢-فەرموودەکانی پێغەمبەر.
٣-تەورات.
٤-مبحث عن منطقة بيتواته، مامۆستا مەلا فەتحوڵلاّ هەرتەلی.
٥-تهذيب التأريخ، مامۆستا مەلا عەبدولقادری باڵەکی.
٦-الشعب الآري، مامۆستا مەلا بایەزیدی دیاربەکری.
٧-دين الاكراد، مامۆستا مەلا قەسیمی بانەیی.
٨-شعلة في درب التأريخ، مامۆستا ئەحمەدی تاجانی.
٩-تفسير الخازن، محمد الصوفي.
١٠-الاكراد و الوثنية، عبيدالله الحيدري.
١١-فجر الاسلام، محمد أمين مصري.
١٢-إثبات الوطنية، أبوكلام آزاد.
١٣-التحفة، الشيخ إبن الحجر الهيتي.
١٤-مروج الذهب، مسعودي.
١٥-فتح العراق، واقدي.
١٦-دبستان المذاهب، أبوكلام آزاد.
١٧-الاكراد، مامۆستا مەلا عەلی قەرەحەسەنی.
١٨-تأريخ العالم، محمد قاسم محمد.
١٩-تأريخ بنى إسرائيل.
٢٠-نخبة الأزهرية.
٢١-نزهة المجالس.
٢٢-تأريخ إبن الأثير.
٢٣-تأريخ إحسان نوري.
٢٤-على بن أبى طالب.
٢٥-أفلاطون اليوناني.
٢٦-أرسطو اليوناني.
٢٧-بلينوس اليوناني.
٢٨-تأريخ الألمان.
٢٩-تأريخ البلجيكا.
٣٠-مستر هولد.

# دانراوەکانی نووسەر

-شەوی ڕووناک: میعراجنامەی پێغەمبەر، لەساڵی ١٩٥٢ لەچاپخانەی تەرەقی لەکەرکوک چاپکراوە، تا ئێستا (١٨) جار چاپکراوەتەوە.

-گوڵشەن: فەرهەنگی کوردی-فارسی-عەرەبی، مەکتەبی شانۆ لەسلێمانی ساڵی (١٩٥٠) چاپیکردووە.

-شەوێك لەگەڵ خەیام: فەلسەفەی لاهوتە بەهۆنراوە، لەساڵی (١٩٧١)، لەچاپخانەی ئەسعەد لەبەغدا چاپکراوە.

-کەڵەمێردی خۆشناو: لەساڵی (١٩٨٣) لەچاپخانەی سەرکەوتن لەسلێمانی چاپکراوە.

# وەرگێڕدراوەکانی نووسەر

-شەڕی کێوی ئوحد: لەزمانی عەرەبی وەرگێڕدراوە بۆ کوردی بەهۆنراوە، لەساڵی (١٩٥٠) لەچاپخانەی تەرەقی لەکەرکوک چاپکراوە.

-یوسف و زولەیخا: لەزمانی فارسی کراوە بەکوردی لەساڵی (١٩٥٤) لەچاپخانەی تەرەقی لەکەرکوک چاپکراوە.

-خەوننامەی کوردی: لەعەرەبییەوە کراوە بەکوردی، لەساڵی (١٩٦٤) مەکتەبی شانۆ لەسلێمانی چاپیکردووە، تا ئێستا (٣) جار چاپکراوە.

-چیرۆکی شێخی سەنعان: لەفارسییەوە کراوە بەکوردی بەهۆنراوە، لەچاپخانەی تەرەقی لەکەرکوک چاپکراوە لەساڵی (١٩٥٦).

# چاپنەکراوەکان

-فۆلکلۆری ڕەسەنی کوردی.

-سورمەخان بەهۆنراوە.

-کورد چۆن ئەگات بەئازادی.

-زانایانی کورد لەهۆزی حەیدەریەکان.

-کۆکردنەوەی ژنی لێهاتووی کورد بەناوی (باغی ئاوات).

عەبدولسەلام محەمەد حەیدەری

سالی ۱۹۲۰ لە گوندی پێنتواتەی خۆشناوەتی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە.

سەرەتای خوێندنی لەلای مەلا محەمەدی باوکی بووە.

سالی ۱۹٤٤ چۆتی ئێران لەلای مامۆستا مەلا صالح بادینی بڕوانامەی خوێندنی وەرگرتووە.

هەر لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ك).

لە دروست بوونی کۆماری مهاباد دا نووسەری پرسگەی پێشەوا (قازی محەمەد) بووە.

سالی ۱۹٤۷ چۆتە یەکێتی سۆڤێت.

سالی ۱۹٤۸ گەڕاوەتەوە نیشتمان.

خاوەنی چەندین کتێب و نامیلکەی بڵاوکراوەیە.

جگە لە زمانی کوردی، عەرەبی و فارسی و تورکی و عیبری بەباشی دەزانێت.

ئێستا لە گوندی دواوەی خۆشناوەتی ژیان بەسەر دەبات.

ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك